د. ناسر عوبێد ئەلناسر

# دیاردەی گەندەڵی

## نزیکبوونەوەیەکی سوسیۆلۆجی - ئابووری

وەرگێڕانی

سەلاّح شاکەلی

کوردستان — هەولێر
٢٠٠٥

انتونی گیدنز، جامعه‌شناسی
ترجمه : منوچهر صبوری، نشرنی، تهران
چاپ دوازدهم ١٣٨٣ ( ٢٠٠٤

**ناوی کتێب:**

- دیاردەی گەندەڵی/ نزیکبوونەوەیەکی سوسیۆلۆجی - ئابووری
- نووسینی: د. ناسر عوبێد ئەلناسر
- وەرگێڕانی: سەلاّح شاکەلی
- نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جمال رواندزی
- سەرپەرشتی چاپ: هێمن نەجات
- بەرگ: هۆگر سدیق
- تیراژ: ٥٠٠ دانە
- ژمارەی سپاردن: (٣٢٨)
- چاپی یەکەم ٢٠٠٥
- نرخ: ٢٠٠٠ دینار
- چاپخانە: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە

زنجیرەی کتێب — ٢١ — (١٢٤)

ناونیشان
. دەزگای چاپ و بلاّوکردنەوەی موکریانی
پۆستی ئەلکترۆنی: asokareem@ maktoob.com
ژمارەی تەلەفۆن: 2260311
www.mukiryani.com

## بسم الله الرحمن الرحيم

## واذا قيل لهم لاتفسدوا فى الارض قالو انما نحن مصلحون

ئەگەر پێشیان وترا گەندەڵکاری مەکەن لەسەر زەوی وتیان بەڵکو ئێمە چاکەکارین.



**پێشکەشە بە**

ـ دوا نیگا پڕگلەییەکانی دایکم ... لە من، لە ئازار، لە خوا، یان لە ڕۆژگار ...نازانم !

ـ ٢٢/١١/٢٠٠٣، دەشتی، گەرچی کۆتاییەکان هەموویان وەك یەکن وەلێ ئازیز سروشتی مرۆڤ ئاوایە.. چاوەڕێم شوێندەستت دیاربێ.

## ناوەڕۆك



## بەشی یەکەم



## بەشی دووەم







## بەشی سێیەم



## بەشی چوارەم



## بەشی پێنجەم



## بەشی شەشەم

**بەشی حەوتەم**



**بەشی هەشتەم**





## دوو رێبەر

یەکەم: گەندەڵی دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی جیهانییەو کەم تا زۆر هەموو دەوڵەتانی جیهانی گرتۆتەوە، گەر بەشێوازو تەکنیکی گەندەڵیدا بچینەوە وا دەزانی کوردستان هەزار ساڵە دەوڵەتە.

بڕواننە دامەزراندن لە دامەزراوە حکومییەکاندا بزانن لێزانی مەرجە یان حزبایەتی و خزمایەتی؟ خۆ دامەزراندن لە رێکخراوە بیانییەکاندا ئەوەندە بەشێوازی ناشیرین بەڕێوە دەچێ شەرمی کوردی لەتەکدا دەتکێ.

پێشکەشکردنی خزمەتە حکومییەکانیش شێوازی بەڕێوەچونی تایبەتی هەیە بۆ نموونە رادیۆو تەلەفزیۆن و رۆژنامە سێ مانگ پێشترو سێ مانگ پاشتر باس لەو بەرمیلە نەوتە دەکەن کە پێشکەشی (بەپارە) خێزانە هەژارەکانی پاشماوەی ئەنفال دەکرێ، لە شارێکی خواپێداویشدا بەپێی بەرنامە نەوت و گازی خویان وەردەگرن و کەس هەر باسیشی ناکات، لە یازدە ساڵی حکومەتی هەرێمی کوردستاندا یەك بوتڵ گاز (غاز) بە ئۆردووگای پاشماوەی ئەنفال (سمود) نەگەیشتووە.

بەرپرسە حکومییەکان نەگەیشتوونەتە ئەو قەناعەتەی یان هەرگیز رانەهێنراون لەسەر ئەوەی کە گەڕەکی (حي موظفين)ی کەلارو ئۆردووگای سمود هەمان مافیان لە وزەی کارەبا هەیە یان منداڵانی سلێمانی و منداڵانی ئاوایی کارێزەی حەمەکەیفە هەمان مافیان هەیە لە کتێب و دەفتەرو قەڵەم. چەند پێویستیمان بە سەرەتاکانی بینراوەیی و لێپرسینەوە هەیە بۆ رووبەڕووبوونەوەی گەندەڵی کە لە کوردستاندا جگە لە هۆکاری رامیاری و ئابووری دوو هۆکاری دیکەشی هەیە، یەکەمیان خۆشەویستی بێسنووری کوردە بۆ پارە وەك بێژی ئایەتی ((وتحبون المال حبا جما*)) تایبەت بۆ ئێمە دابەزیبێ. شلومون کدیمون دەڵێ (پارە هەمیشە لای

کوردەکان مەسەلەیەکی هەرە گرنگ بووەو دەبێ، تا ئەو رادەی حوکمی هەبوون و نەبونی مرۆڤ دەدات**) ئەگەر خۆمان لە هەستی نەتەوایەتی هەرزەکارانەی درۆزنانە رووت بکەینەوە، ئەو قسەیە چەند ڕاست دێتە بەرچاو.

دووەمیان: بەهای خزمایەتیە (عەشرەتچێتیێ، شارچێتیێ). ئەم بەهایە لە کوردستاندا لەسەرووی بەهاکانی حزب و نەتەوەو ئاینیشەوەیە. گەندەڵی خۆی چیەو چۆن ئاشکرا دەکرێت و بەگژاچوونەوەی چۆنە؟ وەڵامی ئەم پرسیارانە ناوەڕۆکی ئەم کتێبەیە.

دووەم: لە وەرگێڕانی ئەم کتێبەدا هەر زاراوەیەك عەرەبییەکەی باوبێ لەناوکورداو بەرانبەری کوردی نەبێ ئەوە عەرەبییەکەیم بەکارهێناوە وەکو ئەخلاق، تەزویر. ئەگەر کوردییەکەشی لەبیرکرابێ لەبەر خاتری وشەی فارسی یان عەرەبی ناو فارسی ئەوە کوردێکەیم بەکارهێناوە وەکو رەوشت (سلوك)، لەشساغی (تەندروستی)، هەڵگێڕانەوە (انقلاب، کودەتا).

هەندێ پاشگرو پێشگری ئارەزوویی هەن کە هیچ زیادە واتایەك نابەخشن بۆیە لەتەك ئارەزووی مندا ناگونجێن وەکو (الخدمة الدولية) کردومەتە خزمەتی دەوڵەتی نەك خزمەتگوزاری نێودەوڵەتی. زیادەڕۆیش زۆر دەکرێ لە رێنووسی کوردیدا هەوڵم داوە وەلایخەم وەکو ئابوورییەکان نەك ئابوورییەکان. واوی لێکدەریش (عەتف) لە زمانی کوردیدا رێك پێچەوانەی زمانی عەرەبیە، عەرەب ئێژن (الليل ــ والنهار) کەچی بەکوردی دەبێتە (شەوو ــ ڕۆژ)، حەزو ئارەزووی لارە نەك یاسای زمان کە ئەم واوە نالکێنرێت بەکۆتایی وشەوە من نوسیومە گەندەڵیو دیمۆکراتی نەك گەندەڵی و دیمۆکراتی یان گەندەڵی وە دیمۆکراتی.***

تیۆرو یاساکانی زمان وەکو هەر زانستێکی دیکە هەمیشە لە پێشکەوتندان و نابێ لەقاڵبدا ڕابگیرێن.



دڵنیاشم ئەم زمانەی من پێی دەنووسم بەدڵی ڕۆڵە بەوەفاکانی (ماجەراو نەوجەوان و ئەلتەرناتیف و ئۆپۆزۆسیۆن و صوت و صورە) نابێت و چاوەڕێی قسەی خێریشیان نیم. زۆر خەمم خوێندکارانە بەتایبەتی سێیەمی ناوەندی و شەشەمی ئامادەیی کە ناچار بووم لەبەر تاقیکردنەوەی وەزاری بەو زمانە ناشیرینەی ناو کتێبەکەیان پرسیاریان بۆ بێنم و لە پەراوێزی وانە وتنەوەشدا بۆیان ڕاست بکەمەوە، ئەوەش کاتی زۆر گەرەك بوو.

ماوەتەوە زۆر سوپاسی ئەم هاوڕێ خوشەویستانەم بکەم، کاك موراد حکیم کە ئەم کتێبەی بۆم نارد تا وەری بگێڕم، کاك عبدالملك شاکەلی کە گشت ئەو نووسینانەم بڵاودەبنەوە دەستنووسی ئەوە، دیارە خەتی خۆم هەندە (جوانە) بەو نەبێ بەکەس ناخوێنرێتەوە، هەردوو مامۆستا ( ئاسۆ ئەحمەد و هیوا محمد عەلی) کە لە کۆمپیوتەری ئەم نووسینە یارمەتیان دام.

**سەلاح کەریم شاکەلی**

* الفجر (٢٠).
* شلومون كديمون، الموساد في العراق و دول الجوار، بدر عقيلي، بيروت،١٩٩٨، ل١١٢.

**دەزگای موکریانی**

لەبەر ئەوەی دەزگای موکریانی پەیڕەوی لە جۆرێکی رێنوس دەکات بە پێویستمان زانی رێنووسەکەی وەرگێڕی بەرێز لە هەندێك شوێندا دەستکاری بکەین، بۆیە داوای لێبوردنی لێدەکەین.

## نـــاســـانـــدن

کتێبی هاوڕێ د. ناسر نزیکبوونەوەیەکی ئابووری - سۆسیۆلۆجی بۆ دیاردەی گەندەڵی لە دوای ڕەنجێکی گەورەو ماوەیەك لە لێکۆڵینەوەی زانستی لە زانکۆو مەڵبەندە لێکۆڵەرەوەکانی قاهیرەوە دێت.

بۆیە خوێنەر هەستدەکات کە بە روحێکی ئەکادیمی زانستی نووسراوە، دوورە لەو وتە ڕۆژنامەییەی کە ئێستا باوە لە هۆیەکانی ڕاگەیاندندا.

ئەو روحە ئەکادیمییەش کە دیاردەی گەندەڵی لە گشت لایەکەوە چارەسەرکردووە شوێنەوارەکانی لەسەر دەوڵەت و کۆمەڵگە دەرخستووە، نەهاتووە پاکانەی ئەخلاقی بۆ گەندەڵی بکات، واتە زانستێتی نووسەرو پرۆگرامەکەی لە شیکردنەوەدا گەیاندویەتیە دیاریکردنی ئەنجامە وێرانکارییەکانی دیاردەی گەندەڵی.

بۆیە د. ناسریش ئەم دیاردەیەی هەڵبژاردووە، چونکە بۆتە یەك لە پێکهێنەرە بنچینەییەکانی پێڕۆی رامیاری و ئابووری عەرەبی، بەڵکو یەکێکە لە ژێرکەنکانی بینای ئەخلاقی کۆمەڵگەی عەرەبی.

لەبەر هەندێ قسەی نووسەر لەسەر گەندەڵی ڕوون و ئاشکرایە، چۆن بۆمان دەلوێ ڕووبەڕووی گەندەڵی ببینەوە ئەگەر هۆیەکانیمان شاردەوە. نووسەریش لەسەر یەك هۆ نەوەستاوە، بەڵکو بەو پەڕی ئازایەتیی ئەقڵی لە گشت هۆکارە مێژوویی و کۆمەڵایەتی و رامیارییەکانی کۆڵیوەتەوە. ئاماژەی کردووە بە نائامادەیی ئازادیە دیمۆکراتییەکان و لاوازی دامەزراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی، نائامادەیی



دامەزراوەی یاسادانان و لاوازی دامەزراوەی دادوەری و نەکاری پارتە رامیارییەکان و نەبوونی رۆحی رکابەری، سەرباری کەمدەسهاتی کە بەپاڵ خەڵك بەرەو گەندەڵی دەبات.

لە راستیشدا نیشانکردنەکەی بۆ هۆکارەکانی گەندەڵی بەسەریەکەوە بواری پێدا کە ئەم پێناسە تیۆرییە ڕاستەی بۆ بکات «گەندەڵی خراپ بەکارهێنانی دەسەڵاتە بەمەبەستی وەدەسهێنانی سوودی مادی لەکاتی نائامادەیی دامەزراوەی رامیاریدا بەواتای هاوچەرخ لەتەك لاوازی بەکاری چاودێری کۆمەڵگەی مەدەنیدا، جگە لەوەی کە گەندەڵی تێپەڕاندنێکی ئاشکرای یاساکانەو دەسدرێژیە بۆ سەر رێسای بەهاکان و پێوەرە ئەخلاقییەکان».

بەڕای منیش دیاردەیەك بەم ترسناکییە پێویستی بەهاوکاری هەموو پسپۆڕانی زانستە مرۆییەکانە لە نیشتمانی عەرەبدا بۆ ئەوەی گەندەڵی لە گشت ئەو روپۆشانەی روومەتە قێزەوەنەکەی دەشارنەوە دابماڵن و بەڕووتی بیخەنە بەردەم هاوڵاتی. کتێبی د. ناسریش وتەیەکە شایانی خوێندنەوەیە.

**د. ئەحمەد بەرقاوی**

## پێشەکی

نزیکبوونەوەی گەندەڵی ئاسان نییە سەرەڕای باش دەرکەوتنی ئەم دیاردەیە کە لە زۆربەی کۆمەڵگە و پێرۆ رامیارییەکاندا هەیە، بەڵکو ئەم دیاردەیە لە تێڕوانینی جیاوازەوە وەردەگیرێت و هەندێ لە لێکۆڵەران باس لە باشیەکانی دەکەن بەرانبەر زۆرینەیەك کە شوێنەوارە خراپەکانی دەردەخەن.

بۆیە گەیشتن بە پێناسەیەکی تەواوی گەندەڵی زەحمەتە لەسەر زۆربەی لێکۆڵەرەکان و تەنانەت فرە سنووریشی دەبینین بەپشت بەستن بە جیاوازی خودی نزیکبوونەوەکە، لەبەر ئەوەش کە لە باسەکەدا پێناسەکانیم خستۆتە ڕوو لێرەدا باسی ناکەم. هەندەم بەسە بێژم گەندەڵی ڕەنگدانەوەی پەیوەندییەکانی هێزی لاسەنگە لە نێوان بژاردەو هەموو توێژەکانی کۆمەڵگە لە دەوڵەتی بیرۆکراتیدا.

سوریش بووین لەسەر دەرخستنی وەزیفە و ئاستەکانی گەندەڵی، لە وەزیفەش مەبەستمان هەڵسەنگاندنی ئەخلاقی نییە، بەڵکو ئەنجامە بابەتیەکانی کە لە نێوان توانای بەرهەمهێنانی کەڵەکەبوون لە دۆخێکدا یان ڕێگرتن لەو کەڵەکەبوونەدایە.

ئەوەش سەرنج ڕاکێشە کە گەندەڵی ـ سەرەڕای هەڵوێستی کۆمەڵایەتی لێی ـ لەوەیە بە ئاشکرا بێ لەو دەوڵەتانەی کە بینراوەیی (شەفافیەت) باوە تێیاندا، لەکاتێکدا بە شاراوەیی دەمێنێتەوە لە دەوڵەتە دکتاتۆریەکاندا. لەگشت بارێکیشدا ناتوانین تێچوی گەندەڵی بە وردی بپێوین.

لەبارەی ئاستەکانیشی هەندێکیمان دەرخستووە، گرنگەکانی ئەمانەن گەندەڵی لە سنووری تەسکدا وەکو بەرتیلی باو، بەرتیلی لەناکاو. هەروەها گەندەڵی لە سنووری گەورەیدا وەکو گەندەڵی ڕێکخراو کە هەندێ لە گەورە بەرپرسانی هەرسێ دەسەڵاتی یاسادانان و ڕاپەڕاندن و دادگەیی دەیکەن. وەلێ ئەم ئاستانەش بە پێی خودی سروشتی پێرۆ ئابووری ـ کۆمەڵایەتیەکە دەگۆڕێ وەکو گەندەڵی لە هەرسێ



جۆری ئابووریدا (ئاراستەکراو، بازاڕ، هاوبەش). سەرباری دیاردەی گەندەڵی نوێ کە گرێبەستە بە پرۆسەی گواستنەوە لە ئابووری پلانرێژەوە بۆ ئابووری ئازاد، ئەم دیاردەیەش بێهاوتایە لە مێژوودا جگە لە قۆناغی داڕووخانی کۆمۆنیستی و دووبارە بەرهەمهێنانی پەیوەندی سەرمایەداری.

لە هەموو بارێکیشداو چەندە گەندەڵی گەورە بووەو بوو بەدیاردەیەکی سروشتی یان لەناکاو، ئەوە هەندێ سنوور هەیە کە نە کۆمەڵگە دەتوانێ لەتەکیدا بژی و نەش دەوڵەت دەتوانێ بەردەوامبێ لە جێبەجێ کردنی ئەرکەکانیدا. لێرەوە بەگژاچوونەوەی گەندەڵی و بەرهەمهێنانی میکانیزمی لە سنووردانی دێتەکایەوەو زۆربەی دەوڵەتانی جیهانیش وادەکەن.

ئەم وتەیەش بەڕاستی دەمێنێتەوە کە ڕێگەکانی ڕووبەڕووبوونەوەی گەندەڵی بەسوودترن لە دەوڵەتە دیمۆکراتییەکاندا بەشێوەیەك بەراورد ناکرێ لەتەك دەوڵەتە توتالیتارییەکاندا. لەبەر ئەوەش شوێنەوارەکانی گەندەڵی هەموو بوارەکانی ژیانی رامیاری، ئابووری، ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی دەگرێتەوە. شایانی باسکردنە، ئەم هەشت بەشەش وەڵامە بۆ ئەم جۆرە پرسیارانە:

گەندەڵی چییە؟ ئایە گەندەڵی ئابووری بەری گەندەڵی رامیارییە یان بەپێچەوانەوە؟ ئایە گەندەڵی دیاردەیەکی بابەتیە یان بەری سیاسەتێکی هۆشیارە؟ بە چ ڕێگەیەك جڵەو دەکرێ؟ ئایا بە بینراوەیی و لێپرسینەوە یان بەسزای توند، یان بە گۆڕینی ئەو بونیادەی بەرهەمی هێناوە؟ شوێنەوارە ئەخلاقییەکانی کامەن؟ پەیوەندی چییە بە چەمکی ماف و ئەرکەوە؟ داخۆ بۆ لە قۆناغی گواستنەوە لە ئابووری پلانرێژەوە بۆ ئابووری بازاڕ بەو خێراییەو چۆنێتیە بڵاوبوویەوە؟ ئایا فرە ئابووری و رامیاری دەبێتە ڕێگر لەبەردەم گەندەڵیدا یان دەبێتە هۆی زۆرکردنی جۆرەکانی؟ ئەگەریش تایبەتکردن لای هەندێ کەس ڕزگارکەربوو لە گەندەڵی، ئەی

بۆ لەو قۆناغەدا بوو بەگشتی؟ لەسەر ئەم پرسیارانەو هی تریش هەوڵی وەڵام دەدەین و رامان دەربڕیوە بەبێ هیچ تێکەڵیەك، وەلێ بەسەر کەسیدا ناسەپێنین.

لە کاتێکیشدا کە نیشتمان بەئاگاهاتەوە لە شوێنەوارە خراپەکانی ئەم دیاردەیەو سەرکردایەتیش توندوتۆڵی و ئارەزووی بەشدارکردنی هەمووانی لە دژ وەستانیدا پیشان دا، ئەوە هەر نیشتمانپەروەرێك ناتوانێ وەکو تەماشاکەر بوەستێ بەتایبەت ئەگەر خاوەن زانیاری زانستی بوو، زانیاریش چ نرخێکی هەیە ئەگەر نەبێتە چەکێکی مادی و بەشدار نەبێ لە بەرزکردنەوە و بەهێزی و خۆشحاڵی و ئازادی مرۆڤدا.

ئەگەریش هەریەك لە ئێمە سوربێ لەسەر مافەکانی و لە هەر مافێکیش چوار ئەرکی لێدەبێتەوە ئەوەش ناسینی مافەکان، ئیشپێکردنی، پاراستنی، ئاگاداری مافەکانی خەڵکانی دی. ئەگەریش هەر یەك لە ئێمە بە گوێرەی ئەخلاقەکانی وەزیفەی گشتی ئەرکەکانی خوی جێبەجێ کرد ئەوە ڕووبەری گەندەڵی تا دوا سنووری دەکشێتەوە. کە گەندەڵیش دیاردەیەکی جیهانیە نابێتە پاکانە بۆ ئەوەی پەسەندی بکەین و لەتەکیدا بژین لە نیشتمانە عەرەبیە گەورەکەماندا.

ئەوەی سەرنج ڕاکێشە گرنگیدانێکی جیهانی لەپڕە بەگەندەڵی هاوڕێ لەتەك هەرایەکی گەورەدا. ئایە ئەمە پەیوەستە بە شۆڕشی پەیوەندی و زانیارییەکان؟ یان بەکۆتایی هاتنی شەڕی ساردو بێدەنگبوون لە کێشەکانی یەکتر کە لەو زەمانەدا باو بوو؟ یان رەوتێکی دەوڵەتی هەیەو لە گەندەڵی دەترسێ لە سێبەری پتربوونی قەوارەی بازرگانی و دەرکەوتنی گروپی گەندەڵکار کە لە هەوڵی پاککردنەوەی پارەدان؟ ئایا لادانی پەردە لەسەر گەندەڵی ئەنجامی وریابوونەوەیەکی نیشتمانیەو شەپۆلی سێیەمی دیمۆکراتی سەپاندویەتی؟ ئایا پێویست نییە لەسەر میکانیزمی خۆگونجاندنی کۆمەڵگەکان لەتەك گەندەڵیدا بوەستن؟ ئەو ڕێگایانەش بناسین کە پێدا ڕۆیشتن بۆ تێپەڕاندن و خۆپاراستن لە زیانەکانی؟ ئەوجار بۆ گۆڕانی



کۆمەڵگەکان بەرەو سەرمایەداری گرێبەست دەبێ بەشتێك لە گەندەڵیەوە هەروەها بەرەو دیمۆکراتیش؟ دواتر ئایا کۆمەڵگەکان پێویستیان هەیە بە برێك لە گەندەڵی وەکو پێویستیەکی بیرۆکراتی؟ ئەی بۆ شتێك لە گەندەڵی وەزیفی بەسوودە وەکو هەندێ زانای کارگێڕی ئەمریکی بۆیچون؟ «برێك لە گەندەڵی پێویستە بۆ کاری رامیاری باش» دابڕانێکی سەیرە گەلانێك بەگژی گەندەڵیدا دەچنەوەو ڕژێمێك پاکانەی بۆ دەهێنێتەوە! لە گشت بارێکیشدا ڕێگەی شەڕکردن لەتەك گەندەڵی لەم بنەمایەوە تێپەڕ دەبێ: جیهانی بیرکەوەو ناوخۆیی جێبەجێ بکە.

ئێستا گەشەپێدان تەنیا ئاڵشتبوونێکی جۆرایەتی نییە لە بینای ئابووریدا، لەلایەنی ڕۆڵی لە زیادکردنی تێکڕاکانی گەشەکردن و بەرزکردنەوەی ئاستی کۆی بەرهەمهاتووی میللی و پەرەپێدانی بڕی بەرهەم و چاکردنی ئاستی ژیانی هاوڵاتیان، بەڵکو گۆڕینێکی ریشەییش لە بونیادی کۆمەڵایەتی دەگرێتەوە، واتە زیادکردنی ژمارەی چینی ناوەڕاست لە ئەندازیاران و تەکنیکاران و گرێدانی زانستی نوێ بەبەرهەمهێنانەوە، سەرباری دەسبەسەراگرتنی پرۆسەی رامیاری بەسەر گرنگیدانی کۆمەڵگە وەکو ئامرازێکی گۆڕین بەرەو باشتر.

گەشەپێدان وەکو سەرەتا واتە گواستنەوە بەرەو کۆمەڵگەیەکی هاوچەرخی بەتواناترو بەکارتر. ئەم دووراییە (بعد) بەهایەکە هانی خەڵك دەدا بۆ گۆڕینی دۆخە باوەکان، سەرەڕای بوونی کەسانێك کە دژی گۆڕانن ئەوانەش بێگومان بەرژەوەندی کەمایەتییەك دەنوێنن لە کاتێکدا گۆڕین بەرژەوەندی زۆرینەی خەڵك دەنوێنێ.

گەشەپێدانی رامیاری لەم ساڵانەی دواییدا بووە جێی گرنگیدانی لێکۆڵەران و پسپۆڕان و زۆرینەی خەڵکیش، چونکە ئەو گەشەپێدانە تەنیا لایەنی ئابووری دەگرتەوە، لایەنی کۆمەڵایەتی پشتگوێ دەخست وەکو ئەوەی لە ولاتانی بلۆکی سۆسیالیستی ڕوویدا پێشترو پاشتریش لە دەوڵەتانی ئەمریکای لاتینی، ئەوانەش لەلایەنی ئابووریەوە ئەنجامی هەستپێکراویان وەدەستهێنا، وەلێ بەشداری رامیاری هاوڵاتیانی تێدا نەبوو.

دوورایی رامیاری گەشەپێدانیش، دوو لایەن لە خۆدەگرێ، یەکەمیان زیادکردنی بەکاری دەوڵەتە لە ئاراستەکردنی چالاکی مرۆییدا، دووەمیش رەخساندنی کەشێکی دیمۆکراتی و بوواردان بە ئازادییە گشتییەکانی هاوڵاتیان بۆ بەشداربوون لە ئاراستەکردنی سیاسەتی گشتی ولاتدا. بەتەواوکاری دەوڵەت و کۆمەڵگەش هەردوو



بەهێزتر دەبن، ئەمە ئەگەر دەوڵەت بە بینراوەیی ئیشی کرد و بەرپرسانیش هەستێکی بەرزیان بە لێپرسراوێتی هەبوو.

بەگژاچوونەوەی گەندەڵی بەتایبەت گەندەڵی رامیاری و کارگێڕی سێ مەرجی پێویستە [1]:

١- بینراوەیی لە ئیشی دەوڵەت و دامەزراوەکانیدا.

٢- حوکمی ژیرانە، واتە دانایی لە بەکارهێنانی دەرامەتەکان و باش هەڵبژاردنی سیاسەتەکان.

٣- لێپرسینەوەی یاسایی بۆ ئەو کەسانەی کاروباری دەوڵەتیان بەدەستە.

سیاسەتە چەوتەکانی دەوڵەت کە لەسەر بنچینەی زانیاری ڕاست، یان جیاکردنەوە لە نێوان بەدیلەکان و هەڵبژاردنەکاندا نەوەستاوە، لەوەیە هەلی باش لە دەست کۆمەڵگە بدات، لەوانە بەرنەخستنی دەرامەتە ئابوورییەکان و توانا مرۆییەکانی بەشێوەیکی باش، ئەگەرچی گەندەڵیش لە ئارادا نەبێ.

بینراوەییش لەم ساڵانەی دواییدا، چەندین کۆڕو کۆنگرەی دەوڵەتی لەسەر بەسراوە تا ئەو رادەی ئەڵمانیا رێکخراوێکی داناوە بۆ پێوانی پلەی بینراوەیی لەناو دەوڵەتاندا، بەپشت بەستن بەهەندێ نیشانە دیاردەکرێ کام دەوڵەت زۆر بە بینراوەیی ئیش دەکات و کامیش کەم. ئەوەش سەرنج ڕاکێشە کە دەوڵەتە پێشکەوتووەکان بەر لە هەموان ئەو کێشەیان دەوروژاند، بەتایبەت ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کە کۆمپانیاکانی بەبەرتیلدان ناسراون بە بەرپرسانی ولاتانی باشور بۆ بردنەوەی پرۆژەنامەی بازرگانی. هەروەها زانیارییەکان تووشبونی بەرپرسانی بەلجیکا، ئیتالیا، فەرنسا شوێنی دیکەشیان دەرخست بەوەرگرتنی پارەو قەرزی ئاسان یان دیاری بەنرخ بۆ بەرێکردنی پرۆژەنامەی گومانلێکراو، تا

ئەو ڕادەی گەندەڵی گەیشتە فەرمانبەرانی دەزگەکانی یەکێتی ئەوروپا، وای لە پەرلەمانی ئەوروپی کرد هەموو ئەندامانی لیجنەی یەکێتی دەربکا، چونکە سستبوون لە دۆزینەوەی لایەنەکانی گەندەڵی دارایی یان تووشبوونیان بەکێشەی گەندەڵی رامیاری.

هەندێ کەس سوربوونەکەی ئەمریکا لەسەر بینراوەیی دەگەڕێننەوە بۆ دۆڕاندنی کۆمپانیا ئەمریکیەکان لە چەندین پرۆژەنامەی دەوڵەتیدا، بەهۆی زیرەکی کۆمپانیاکانی تر لە دروستکردنی پەیوەندی گومانلێکراو بەگەورە بەرپرسانی ئەو دەوڵەتانەی پرۆژەنامەکانی تێدا گرێدراوە.

بە چاوپۆشین لەو لایەنەی کە کێشەی بینراوەیی وروژان. کێشەکە پەسەند دەکرێ لە گشت ئەو دەوڵەتانەی درکیان بەوە کردووە کە نائامادەیی بینراوەیی و لێپرسینەوە و حوکمی ژیرانە زیانی زۆر دەگەیەنی بەو کۆمەڵگەیانەی ئەم جۆرە راگرانەی تێدا نەبێت و لە هەموو ئاستەکانی ئەخلاقی، رامیاری و ئابووریدا.

لەسەر ئاستی ئەخلاقی ئەو تێڕوانینە وندەبێ کە وایدادەنێ کارکردن پێداویستییەکی ژیانیی یەکەمی مرۆڤە، بەڵکو تێڕوانینی خەڵك بۆ دڵسۆزی و متمانەو پاکیش دەلەرزێتەوە. لەلایەنی رامیاری و ئابووریشەوە ئەو تێڕوانینە ریشە دەکوتێ کە وای دەبینی خەڵك پارەی هەبێ دەسەڵاتیشی هەیەو ئەوەش خاوەن دەسەڵات بێ خاوەن پارەشەو وەزیفە بەکاردەهێنن بۆ وەدەسهێنانی دەسکەوتێك کە لادانە لە یاساکان و عورفە باوەکانی کۆمەڵگە، ئەگەریش پاڵنەری بڕیارە ئابووریەکان وەدەسهێنانی دەسکەوتی هەنوکەیی تەسك بێت بۆ گەورە بەرپرسان و خێزان و هاوڕێیەکانیان، ئەوە پێرۆی رامیاری رەوایەتیەکەی لەدەست دەدات، واتە قەبووڵکردن و کارلێککردنی هاوڵاتیان لەتەك دامەزراوەکانی دەوڵەتدا، ئەوجا سستی رامیاری و ئابووری و نامۆبوونی سایکۆلۆجیش روودەدات،



خەڵکیش واز دەهێنن لە بەشداربوون لە بەرنامەکانی حکومەت کە باوەڕپێکراوی لە دەسدەدات و هاوڵاتیان باوەڕیان پێی نامێنێ، هەر ئەمەش بوو لە رۆمانیا و ئەندونیسیا و بەرازیل و کۆنگۆدا روویدا و شوێنی دیکەش بەرێوەیە.

چەندین ئەزموونی گەشەپێدان هاورێ بوو لەتەك چەندین حاڵەتی گەندەڵی رامیاری و کارگێڕی و دارایی، هەروەکو ئەوەی لە سێبەری کۆماری سێیەمی فەرەنسادا روویدا یان لە ئیتالیا یان لە کۆریای باشور، بەڵام بەگژاچوونەوەی گەندەڵی مەرجی سەرەکی گەشەپێدانی بەردەوامە بۆ جێگیرکردنی ئارامی رامیاری و ئابووری و کۆمەڵایەتی، دواتریش پتەوکردنی رەوایەتی تەواوی پێرۆ رامیاریەکە، بەدەنگەوەچوونی هیواو ئاواتی هاوڵاتیان بە ژیانێکی ئازادی جوامێرانە، بواریان پێبدا بەشدار بن لە وەرگرتنی بڕیارە رامیاری و ئابووریەکان کە گەشەپێدانی راست وەدەست دێنێت و دەبێتە رێگر لە پێش دەوڵەمەندبوونی بەرپرسە حکومییەکان بە رێگەی نارەوا کە لێپرسینەوەی یاسایی بەشوێندا دێ.

لەم لێکۆڵینەوەیەدا دەچینە سەر مەرجە پێویستەکانی وەدەسهێنانی پرۆسەی گەشەپێدانی ئابووری و کۆمەڵایەتی بەسەرکەوتوویی، ئەویش بینراوەیی و لێپرسینەوەو حوکمی ژیرانەیە سەرباری هەندێ مەرجی تر وەکو بەکاری حکومەت و تواناو شارەزا کارگێڕیەکەی.

ئەم مەرجانەن کۆمەڵگە دەپارێزن لە دەردی گەندەڵی و ئەوەی پێوەی دەلکێ لە دیمەنی ئاژاوە و بەرەڵایی و بێباکی و نەبوونی هەستی بەرز بە لێپرسراوێتی. لەسەر ئەوەش ئەگەر بنەما رێکخەرەکانی ژیانی گشتی بنەمای بابەتی و ئاشکرابوون، ئەگەریش بڕیارەکانی حکومەت لە لایەنەکانی هەڵبژاردن و پشت بەستن و پاکانەو پاڵنەرەکانییەوە بابەتیبوون، ئەگەریش بەرپرسەکان هەریەك لەبواری خۆیدا لەسەر ئاستی هەرسێ دەسەڵاتەکە ملکەچی چاودێری پێشتر و پاشتر بن، ئەگەریش ئەو

بەرپرسانەی لە یاسا لایانداوە پێیان زانیبێ یان نە، ئەگەر لەکاتی خۆیدا لادران، ئەوە بوونی ئەم سێ مەرجە گەشەپێدان بەرەو پێشەوە دەبات و گەندەڵی و بەفیڕۆدانی دەرامەتیش کەمدەکاتەوە.

دیاردەی گەندەڵی دیاردەیەکی ئاڵۆزەو کێشە رامیاری و کارگێری و داراییە و ناوخۆیی و دەرەکیەکانی تێدا دەچنە یەکداو دەبنە تەواوکاری یەکترو بازنەی بەتاڵ پێکدێنن، کە پێویست بەشکاندن دەکات بە:

١- دانانی پێڕۆیەکی رامیاری لەسەر سەرەتای فرەیی رامیاری پشت بەستوو بە هەڵبژاردنی گشتی پاك و ئاشکراو هەرسێ دەسەڵاتەکە لێك جیاکاتەوە، سەرباری رێزگرتن لە مافە مەدەنی و رامیارییەکانی هاوڵاتیان. هەر بۆ زانین دیموکراتی سەرەڕای ئەو بینراوەیی و ئاشکرایی و راشکاوەیی و دۆزینکارییەی کە تێیدایە کۆمەڵگە لە گەندەڵی ناپارێزێ، بەڵام لە سێبەریدا گەندەڵی نابێتە دیاردەو دەتوانرێت بەئاسانی گەمارۆ بدرێت و بنبڕبکرێت، ئەویش بە لێپرسینەوەی بەرپرسان و ڕاستکردنەوەی ئەو سیاسەتانەی دەبنە هۆی بەفیرۆدانی دەرامەت، کەچی لە پێڕۆ تۆتالیتاریەکاندا گەندەڵی دەبێتە دیاردەو رووبەڕووبوونەوەی ئەرکی گرانەو تێچوکەشی زۆرە لەسەر کۆمەڵگە.

٢- دانانی دەزگەی چاودێری بۆ زانینی چوارچێوەی سامانی گەورە بەرپرسان و سەرچاوەی ئەو سامانە لەماوەی بەرپرسیەکەی و دواتریش.

٣- دانانی یەك دەزگەی چاودێری، کە سەربەخۆ بێت و دەسەڵاتی فراوانی هەبێ لە چاودێری کردنی هەرسێ دەسەڵاتەکەدا. ئەو دەزگەیەش راپۆرتی خولی لەسەریان ئامادەبکات و ئەو ڕاپۆرتانەش لەبەردەستی هاوڵاتیان و بەرپرسە حکومیەکان و پەرلەمانتارەکان و دامەزراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنیدا بن.



٤- بەدەنگەوەچوونی حەزو پێداویستیەکانی هاوڵاتیان بەدابینکردنی ئاستێکی شیاو لە ژیانی باش و پڕکردنەوەی پێداویستیە بنچینەییەکان لە خۆراك و شوێن و فێرکردن و لەشساقی. هەروەها هەمووان بواری ئیشکردنیان هەبێت، کرێ و بەرهەمیش پەیوەست بکرێن. ئەگەرنا لەوەیە گەندەڵی بڵاوببێتەوە و ببێتە شێوازێك بۆ ژیان، بەرپرسە حکومییەکان لە گشت ئاستە بچووك و ناوەندی و بەرزەکاندا پەیرەوی بکەن.

٥- هۆشیارکردنەوەی رامیاری بە بڵاوکردنەوەی کەشی رۆشنبیری رەخنەگر کە رێز لە رای بەرانبەر بگرێت، بتوانێت سنوور دابنێ بۆ چونە ناو گەندەڵکاریەوە، پێویستە هۆیەکانی ڕاگەیاندن بخرێنە گەڕ بەتایبەت بینراوەکان بۆ بەرزکردنەوەی بەها کۆمەڵگەییەکان وەك پاکی و خۆبەختکردن و قوربانیدان و خۆنەویستی، رکدان لە سیفەتە پەسەندە بنجبەستووەی کۆمەڵگە وەك متمانەو هەستکردن بە بەرپرسیارێتی تاکی و کۆمەڵی. سەرکردەکان و بەرپرسانی دامەزراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنیش نموونەی بەرزو پێشەنگی باشیان بۆ بێننەوە.

لەم ساڵانەی دواییدا، لێکۆڵینەوەکان رکیان دابوو لە مەرجە رامیارییەکانی گەشەپێدان وەك حوکمی ژیرانەو بینراوەیی و ئاشکرایی و لێپرسینەوە وەکو مەرجێکی بنچینەیی بۆ بەردەوام بوونی پرۆسەی گەشەپێدان کە لە وڵاتە گەشەسەندووەکاندا دەدا لە کێشەی گەندەڵی و ئەمەشیان لە رەوایەتی و جێگیری پێڕۆ رامیاریەکە کەم دەکاتەوەو پێویستیش بە چاکسازی دەکات بە دابینکردنی رەوایەتی، یەکسانی، چاودێریو چاکسازی کارگێری بۆ بەرەوپێشچوون لە پراکتیزەکردنی نموونە نوێخوازیەکەی ژیانی ئابووری.

## مەرجە رامیارییەکانی گەشەپێدان

دوورخستنەوەی نموونەی نوێخوازی (التحدیث) بە ناوەڕۆکە رۆژئاواییەکەی کە بەلیبرالیەتی رامیاری و ئابووری ئیش دەکا، لە دەوڵەتانی باشوردا هانی لێکۆڵینەوە هاوچەرخەکانیدا بۆ گەڕان بەشوێن مەرجێك کە شیاوی جێبەجێ کردن بێ، چ لە دەوڵەتە پێشکەوتووەکان و چ لە گەشەسەندووەکاندا، ئەم گەڕانەش بە شوێن رێسایەکی بەهاییدا چڕبوونەوە کە بشێت بۆ هەموو گەلان، و ئەگەر پابەندی بن ئەوە هەر دەگەن بە حوکمی ژیرانەو پراکتیزەکردنی بەڕێوەبردنێکی هاوچەرخ بۆ کاروباری دەوڵەت و کۆمەڵگە، ئەمیش لای خۆیەوە پەیوەستە بە بینراوەیی و لێپرسینەوەوە، ئەگەریش پابەندی نەبن ئەوە حکومەتی گەندەڵکار سەردەکەوێ.

کەواتە مەرجە رامیارییەکانی گەشەپێدان لە دوای بەهەند وەرگرتنی تایبەتیەتی رۆشنبیری وڵاتە گەشەسەندووەکان ئەمانەن [٢]:

١- پێڕۆی رامیاری بەکار بێت و بە دڵی خەڵك بێ، لە زۆربەی دەوڵەتە گەشەندووەکانیشدا وا نییە، واتە حوکمەکانیان بۆگەنە.

٢- بوونی رێسایەکی بەهایی کە رەنگدانەوەی کولتوورێکی رامیاری بێ بۆ نەهێشتنی کێشەو ململانێی فەرمانڕەوایان و هاوڵاتیان بەبێ توندوتیژی، مەرجەکانی رکابەری ئاشتیانەش بێنێتەدی لە نێوان هەردوو لادا، سەرباری چەسپاندنی بەهاکانی لێبوردن و وەرگرتنی رای ئەم و رای ئەویش.

٣- پاهەڵنان لە چاکسازی لە پەیکەری ئابووریدا بە شێوەیەك رێ لەو پەستان و نائارمیە بگرێ، کە دەبنە تەگەرە لە پێش پرۆسەی گواستنەوە دیمۆکراتییەکان لە کۆمەڵگەدا.



٤- بەشدارکردنی دامەزراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی لە داڕشتنی رامیاری و پراکتیزەکردنی سیاسەتە ئابوورییەکان. هاوکاری بنیاتنەری دەوڵەت و کۆمەڵگە مەرجێکی پێویستی گەشەپێدانە، ئەو پەیوەندیەش کە رۆحی هاوکاری باوبێ تێیدا، جێبەجێکردنی بەرنامەکانی دەوڵەت ئاسانتر دەکات و بەتوانای دەکات لە بەشینەوەی دەرامەتەکان بەشێوەیەکی دادوەرانەو پاراستنی پێڕۆی رامیاری بەبێ پەنابردنە بەر ئامرازی زۆرەملێ.

٥ـ کارلێککردن لەتەك رێکخراوەکاندا بۆ پەلەکردن لە پرۆسەی گەشەپێدان بەبێ دەستێوەردان لە بڕیاری نیشتمانی سەربەخۆ.

## پێگەیشتوویی حوکم (حوکمی ژیرانە)

حوکمی ژیرانە بەگوێرەی رێسا بەهاییە باوەکانی هەر کۆمەڵگەیەك فراوان دەبێت و تەسك دەبێتەوە، هەیە لەناو ئەم چەمکەدا باس لە بینراوەیی و لێپرسینەوە دەکات و هەیشە زیاتر دەچێت و میکانیزمی ئابووری بازاڕو ئەرکی ئابووری دەوڵەتیشی دەخاتەسەر.

گۆڕینەوەی حوکم و ژیرێتیەکەی ئاستی پەیوەندی دەسەڵات و کۆمەڵگە پیشاندەدات. مۆنتسکیۆ و جۆن لوکیش بەر لە دوو سەدو ئەوەندەساڵ باسیان لێوەکردووە. حوکمی ژیرانەش جێگرەوەی دیمۆکراتی نییە، چونکە حوکمی ژیرانە دەبێ دیمۆکراتی بێت و دەشبێت دکتاتۆری بێت. واتە مۆرکی کۆمەڵایەتی ـ چینایەتی دەسەڵات رووبەری رەوایەتیەکەی دیاریدەکات، هەرچی کرۆکی دەسەڵاتە جیانابێتەوە لەو پێڕۆ رامیاریەی کە لە ئیشە ئابووری و رامیارییەکاندا پیادەی دەکات.

دەسەڵاتی ئاقڵ ئەوەیە نوێنەری بەرژەوەندی توێژە فراوانەکانی کۆمەڵگەبێت و دیموکراتی لەباوەش بگرێت. بەبوونی ئەم دوو مەرجەش دامەزراوەکانی دەسەڵات بەتواناتر دەبن لە خۆپاراستن لە رەگەزەکانی گەندەڵی، گەر زانیمان دەوڵەتی ئاقڵیش بێبەش نابێ لە گەندەڵی، بەڵام نابێ بەدیاردەو لە رەوشتی (سلوك) تاکی دیاریکراو تێناپەڕێت و بە ئاسانی و بەسزای توند دەتوانرێت بنبڕ بکرێت.

کەچی لە دەوڵەتە ناگرێبەندیەکاندا کە دەسەڵات خۆی دەسپێنێت، هەر زوو گرێبەستێکی ناپیرۆز لە نێوان دەسەڵات و پارەدا دروست دەبێت، لەم بارەشدا گەندەڵی دەبێتە دیاردەیەك لە ریشەکێش کردن نایەت ئەگەر میکانیزمەکانی حوکم، ئەگەرچی ئاقڵیش بێت، نەگۆڕدرێن.

**یەکەم : دوورایی دامەزراوەیی حوکمی ژیرانە**

بەڕێوەبردنی وڵات بەرێگەی راستدا ناڕوات ئەگەر هەردوو رەگەزی بینراوەیی و لێپرسینەوە نەبن، ناشبێ بەبێ پەیکەرێکی دامەزراوەیی کە بگونجێت لەتەك قۆناغی گواستنەوە دیموکراتییەکان و بەدەنگی پێداویستیەکانەوە بچێت. کەچی لە دەوڵەتە گەشەسەندووەکاندا ئەو دامەزراوە رامیارییەیان تێدا نییە کە بەدەنگ پێداویستیەکانی گەشەپێکردنی ئابووری و کۆمەڵایەتی وە بچێت و لەتەك گۆڕدراوە تازەکانی کۆمەڵگەدا بڕوات.

حوکمی ژیرانەش دەبێ پلانێکی درێژخایەن بۆ گەشەپێکردنی ئامانجدار دابنێ، هیواو ئاواتی خەڵك لە ئازادی ئابووری و باشکردنی ئاستی ژیان بنوێنێ. دانانی پلانی گەشەپێدان و میکانیزمی جێبەجێکردنی لە ئەستۆی دامەزراوەکانی دەسەڵاتدایە، بۆ ئەوەی حکومەتیش بتوانێ ئامانجەکانی بەجێبێنێ، پێویستی بە



دامەزراوەگەلێك هەیە توانای کۆکردنەوەو ئامادەکردنی رای گشتی هەبێ لە پێناوی جێبەجێکردنی سیاسەتەکانیدا.

بێگومان ئەگەر سەرکردەی بەتواناو بوێرو خاوێن هەبن ئەوە دەسەڵات چاکەکارتر دەبێ، لە زۆربەی دەوڵەتە گەشەسەندووەکانیشدا وانییە، سەرباری فشۆڵی دەسەڵاتەکانیان کە سەرکردەکانیان لەو گۆڕینکارییە ریشەییەی کۆمەڵگەکانیان لە دواکەوتن و شوێنکەوتوویی دەگوێزرێتەوە بۆ گەشەسەندن و پێشکەوتن، دەترسن. هۆی ئەو ترسەش لەوەیە تێچوی کۆمەڵایەتی گرانبایی بێ لەلایەك و لەلایکی تر وەڵامدانەوەی پێداویستیەکانی گەشەپێدان بێ کە گۆڕینی سەرکردە رامیارییەکان و بەڕێوەبەرە حکومیە بیروکاتیەکان وەکو پێویستیەك بە شوێن خۆیدا دێنێ، ئەوانەی لە سێبەری بەناو ئارامیدا لانەیان کردووە و لە ئەنجامیشدا «مردنی لەسەرخۆ» دەگەیەنێ، دیاردەی گەندەڵیش بەو و لەتەك ئەودا چەسپاوە، ئەمەش دژ وەستانێکی تەواوە بەبینراوەیی و لێپرسینەوە وەکو دوو مەرجی سەرەکی گەشەپێدانی ئابووری بوێر.

بەگوێرەی حاڵ چەندە سەرکردە نیشتمانییەکان گۆڕین نەکەن لەگشت ئاستەکاندا هەندەش پەستانی جەماوەری توند دەبێ کە ئەویش زۆرجار پێشڕەوی رێکخراوەیی بەکاری پێویستدە بێ.

بەبێ رەچاوکردنی تایبەتیە نشتمانییەکانی هەر کۆمەڵگەیەك، زەحمەتە لە دوورایی دامەزراوەیی گەشەپێدان بکۆڵدرێتەوەو یەك نموونەی گەشەپێدان بدۆزرێتەوە شیاوی پراکتیزەکردن بێ لە هەموو دەوڵەتان، هەڵبژاردن و تاقیکردنەوەی ئەو نموونانەش ئیشی هەمان ئەو سەرکردە رامیاریانەیە، هەڵبژاردنی ئەم نموونە یان ئەو تاڕادەیەك دەربڕی حوکمی ژیرانەیە.

## دووەم : دوورایی ئابووری

هەرگیز ناکرێ دووریە ئابوورییەکانی مەرجە سیاسییەکانی گەشەپێدان پشتگوێ بخرێن، لەکاتێکدا ئەوان رەنگدانەوەی کێشەکانی جێگیرکردن و گونجاندنی پەیکەری ژیانی ئابوورین و رۆڵ و سنووری بەکاری دەوڵەت لە دیاریکردنی تێکڕایەکانی گەشەی ئابووری و دڵنیاکردن لەباش بەڕێوەچوونی ئابووری، بەڕێوەبردنێك، توانای مژینی ئاریشەکان و رووبەڕووبوونەوەیانی هەبێ بەپاهەڵنان لە چاکسازی ئابووری ئامانجدار.

چەندیش دەوڵەتە گەشەسەندووەکان ئاستی جێبەجێکردنی ئابووری و کارگێڕیان بەرز بێت هەندەش کێشە کۆمەڵایەتی و ململانێ رامیارییەکانیان کەم دەبێتەوە، چەندیش کەشی لێبوردەیی و وەرگرتنی رای بەرانبەرەکەشی باو بوو هەندەش ئاستی بەڕێوەبردنی ئابووری چاك دەبێ. پێچەوانەکەشی راستە، ئەگەر ئاستی بەڕێوەبردنی ئابووری لاواز بوو، ئەوە بێزاری خەڵك ئەوەندە توند دەبێ تاڕادەی هەڕەشە نەك هەر لە ئارامی رامیاری، بەڵکو لە تەواوی رێڕەوی گەشەپێدانەکە. پێویستی پرسکردن بە جەماوەرو بەشدارکردنی لە دارشتنی سیاسەتە ئابووریەکان و جێبەجێکردندا لێرەوە دێت، لەڕێی دامەزراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی کە زۆرجار بەکار نییە لە دەوڵەتە تازە پەرەسەندووەکاندا.

## سێیەم : کۆمەڵگەی مەدەنی

دامەزراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی یەك لە گرنگترین سوچەکانی حوکمی ژیرانەیە. ئەگەریش بەکارخرا دەتوانێت پەلە بکات لە گەشەپێداندا بەتایبەت ئەگەر سەربەست بوو لە دەسەڵات و باڵکێشانی دەوڵەت، ئەوە دەبێتە بەربەرەکانێی لەتەك دەوڵەتداو رۆڵی خۆی دەبینێ لە لێپرسینەوەی فەرمانبەرو بەرپرسە حکومیە بێخەمەکان.



پەیوەندی ئاڵوگۆڕی دامەزراوەکانی مەدەنی و دەوڵەت بەگوێرەی سروشتی پێرۆ رامیاریەکەو ئەو قۆناغە مێژوییەی پێدا تێدەپەڕێ تەسك یان فراوان دەبێتەوە، هەندێ کەس لەم دامەزراوانەدا دژی بەرهەڵستکاری دەوڵەت دەبینن، هەندێ کەسی تر به بەرانبەری ئاینی دادەنێت، واتە گشت و تایبەت لە شێوازی پەیوەندی دەوڵەت و دامەزراوەکاندا لە رۆشنایی ئینتمای ئایدۆلۆجی دیاری دەکرێ.

بەکاری کۆمەڵگەی مەدەنی لە دەوڵەتە تازە پەرەسەندووەکاندا بەستراوە بەسنووری دەسەڵاتی دەوڵەتەوە، بۆئەوەی دامەزراوەکانیش بەکاربن پێویستە لە سەرەتادا نوێنەری بەرژەوەندی زۆرینەی خەڵك بن و رێزی جیاوازیەکانی نێوان دامەرزاوەکان لە دیوێك و نێوان دامەزراوەکان و دەوڵەت لەدیوێکی ترەوە بگرێت، بەڵام لەڕاستیشدا زۆرجار دەوڵەت لەم وڵاتانەدا لە هەوڵی دانانی دامەزراوەی مەدەنی ناحکومیدان، کە بەناوی دەوڵەتەوە قسەبکات و لەو پەڕاوێزەدا چالاك بێ کە دەسەڵات بواری پێداوە. واتە لێرەدا دامەزراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی لە هەوڵی بەرگریکردندان لە دەوڵەت زیاتر لەوەی رکابەری بکەن، چونکە سەربەخۆ نین لێی. ئەمەش پێچەوانەی پرۆسەی فرەحزبیە[٣]، بۆیەش هەوڵ دراوە بۆ دیاری کردنی راگرە گرنگەکانی، بۆ دروستکردنی ئاماژە چەندایەتیەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی و شیکردنەوەی تایبەتێتیەکەی لە وڵاتانی جیهانی سێیەمدا.

کۆمەڵگەی مەدەنیش وەکو مەرجێکی بنچینەیی گەشەپێدان وەکو پێویست بوونی نییە لەبەر هۆی بۆماوەیی یان ئێتنی، خوێنی و ئاینزایی کە بەتاك و بەکۆ ململانێ دەکەن لە چوارچێوەی دامەزراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنیدا، لە ئەنجامی ئەو دژوەستانە بەشەڕهاتووەی نێوان دامەزراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنیش زۆرجار لە ئامانجەکانی خۆی لادەدات و بەرەو وەدیهێنانی بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی دەچێت دوور لە بەرژەوەندی کۆمەڵگە، ئەمەش وادەگەیەنێت کە زۆربەی وڵاتە گەشەسەندووەکان یەکێتی بەرژەوەندیان نییە لەنێوان توێژەکانی کۆمەڵگەدا کە لە

ململانێدان لەبەر دژوەستانی بەرژەوەندییەکان، ئەمەش دەسوەردانی دەوڵەت دەسەپێنێ بۆ پاراستنی بەرژەوەندی ئەو توێژانەی بڕیاری دەوڵەتیان بەدەستە، ئەمەش بەکاری کۆمەڵگەی مەدەنی لاواز دەکات لە دانانی پەیوەندیەکی هاوتا لەتەك دەوڵەتدا.

**چوارەم: ڕۆڵی ڕێکخراوەکان و دامەزراوە دەوڵەتیەکان**

ڕێکخراو و دامەزراوە دەوڵەتیەکان وەك سندوقی پارەی دەوڵەتی و بانکی دەوڵەتی و ڕێکخراوی بازرگانی جیهانی و ... هتد کەم تا زۆر دەسوەردەدەن لە ڕەسمکردنی ڕێڕەوی گەشەپێدان لە چەندین دەوڵەتی باشوردا بەو قەرزو یارمەتی و بەخشینانەی پێشکەشیانی دەکەن، کە زۆرجار بۆ پاڵپشتکردنی فرە حزبی و رامیاریەو وەکو یەك لە دووراییە دامەزراوەییەکانی گەشەپێدانی رامیاری، پتەوکردنی سەربەخۆیەتی دامەزراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی تا بتوانن ئەو سیاسەتە چاکسازییە ئابووری و کارگێڕیە بسەپێنن کە ڕیکخراوە دەوڵەتیەکان پەسەندی دەکەن.

ڕێکخراوە دەوڵەتیەکانیش لەژێر دروشمی بریقەدارو لەخشتەبەردا وەك دیمۆکراتی، مافی مرۆڤ و ئازادی ڕادەربڕین دەسوردەدەن و یارمەتی دەرژێننە سەر ئەو حکومەتانەی کە بەدەنگ دەرمانە «چاکسازیەکانیانەوە» دەچن، لەوانەشە قەرزی سەر هەندێ دەوڵەتی ڕەوشت باش بەگوێرەی پێوەرە ئەمریکیەکان بسڕێتەوە، لەبەرانبەریشدا یارمەتی دەبڕن و سزا توند دەکەنە سەر ئەو دەوڵەتانەی وا لە هەوڵی سەربەخۆیی بڕیارە ئابووری و رامیارییەکاندان و پرۆسەی گەشەپێدان لە ڕۆشنایی بەرژەوەندییە نیشتمانییەکان وەجێدەگەیەنن، لە واقعیشدا ئەم تێڕوانینە ڕەنگدانەوەی حکومی ژیرانەو چاکە، بگرە مەرجێکی بنچینەیی گەشەپێدانە.



گۆڕانکارییە ئابوورییە دەوڵەتیە هاوچەرخەکان بوونە هۆی کەمبوونەوەی ڕۆڵی دەوڵەت و زیادبوونی ڕۆڵی میکانیزمەکانی ئابووری بازاڕ، تەنانەت جیهانگیری هەندێ دامەزراوەی مەدەنی دەرخستووە کە سەر بەدەوڵەت نییەو لە ملکەچیشی دەرچووە، ئەمەش ڕۆڵی دامەزراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی لاوازکردووە لە ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو کۆمپانیایانەی لە ئاستی دەوڵەتیدا چالاکن و لە هەوڵی سەپاندنی مەرجی رامیاریدان بۆ گەشەپێدان کە لە خزمەتی بەرژەوەندی خۆیاندابێ نەك ئەو دەوڵەتانەی مەبەستن، هەر بۆ زانین هەندێ حکومەتی دەوڵەتی گەشەسەندوو بەرگری کردووەو دەیکات لە چالاکی ئەو کۆمپانیانە. هەندێکیش بەدەنگ مەرجەکانیانەوە چون لەژێر کاریگەری لەخشتەبردنی بەرپرسە حکومیەکان، سەرچاوەی ئەمەش گەندەڵیە کە حوکمی ژیرانەی لاوازکردووە و لاوازی دەکات و بەو پێیەش دیاردەی گەندەڵی ڕامیاری و کارگێڕی لە هەندێ دەوڵەتدا گەشەپێدان دیاردەکات لە خزمەتی بەرژەوەندیە دەرەکیەکانە نەك نیشتمانییەکان.

## گەندەڵی تەگەرەیەکی سەختــە لەڕێی گەشەپێداندا

کێشەی گەندەڵی رامیاری و کارگێڕی کۆسپێکی سەرەکیە لەڕێی گەشەپێدانی ئابووری و کۆمەڵایەتی، بۆیە ڕووبەڕووبوونەوەی شتێکی ناچاریە بۆ لە سنووردانی ڕەنگدانەوە خراپەکانی لەسەر ڕێڕەوی گەشەپێدان، بەبێ ناسینی هۆکارەکانی گەندەڵیش چارەسەرکردنی ئەنجامەکانی بێسوودەو تا ئەو هۆکارانە هەبن گەندەڵیش هەر دەبێ.

ئەمەو دیاردەی گەندەڵی لە دەوڵەتە تازە پێگەیشتووەکاندا زیاتر بڵاوە تاکو دەوڵەتە پێگەیشتووەکان کە لە هەوڵی زاڵبووندان بەسەریدا بەکۆمەڵێ میکانیزمی

ئابووری تا شوێنەوارە ڕووخێنەرەکانی لە سنوور بدەن، لەکاتێکدا گەندەڵی بووە بەدیاردەو بەپلەی جیاواز هەیە لەگشت کۆمەڵگەکاندا، وەلێ لە وڵاتە گەشەسەندووەکاندا زۆر زیاترە.

ئەگەریش رووبەری گەندەڵی دیاری کراوبوو، ئەوە رووبەڕووبوونەوەو دۆزینەوەی هۆکارەکانی ئاسانترەو زووتریش شوێنەوارەکانی دەسڕدرێتەوە، بەڵام ئەگەر بڵاوبوەوەو بۆ بە دیاردەیەکی گشتی ئەوە ئیش و کاتی زۆر گەرەکە سەرباری تێچوی بنبڕکردنی کە فرە گران دەکەوێ لەسەر کۆمەڵگە.

لەم ساڵانەی دواییدا کێشەی گەندەڵی بۆ بەجێی گرنگیدانی کۆڕو کۆنگرە هەرێمی و دەوڵەتییەکان، کۆبوونەوەی ساڵانەی سندوقی پارەی دەوڵەتی، بانکی دەوڵەتی و ڕێکخراوی هاوکاری ئابووری و گەشەپێدان ... هتد هەمیشە باسیان لێوە کردووە. سەرباری دامەزراندنی ڕێکخراوێلێکی ناحکومی کە بانگەوازی بینراوەیی و لێپرسینەوە دەکەن وەکو «ڕێکخراوی بینراوەیی دەوڵەتی» کە کۆنە شارەزای بانکی دەوڵتی «پیتەر ئیجن» لەساڵی ١٩٩٣ دایمەزراندو ڕاستگۆیانە بانگی حکومەت و کۆمپانیا ئەندامەکانی دەکرد بۆ ئەوەی چیتر پارەو بەرتیل وەرنەگرن. زۆربەی لێکۆڵینەوەکانیش گەیشتنە ئەوەی کە هۆکاری سەرەکی دیاردەی گەندەڵی، قۆرخکردنی هێزە لەلایەن بەرپرسانەوە، نەبوونی بینراوەیی و لێپرسینەوە..



## پلانی چارەکردنی گەندەڵی

رووبەڕووبوونەوەو نەهێشتنی شوێنەوارە لاوەکیەکانی گەندەڵی پێویستی بەگرتنەبەری ستراتیجیەتێکی پتەوە کە ئەمانە بەهەند وەربگرێ:

١ـ گەندەڵی رامیاری و کارگێڕی دیاردەیەکی رووخێنەرە بۆ پرۆسەی گەشەپێدانی ئابووری و کۆمەڵایەتی و بۆ ئەوەی ئەم دیاردە ریشە نەکوتێ لە کۆمەڵگەدا دەبێ ریشەکێش بکرێ. ئەگەرچی هەندێ کەس لایەنی باشیشی تێدا دەبینن لەبەرانبەری بیرۆکراتیەتی حکومیدا وەکو هنتگتون کە ئێژێ «برێك لە گەندەڵی دەتوانێ بەشدار بێ لە پێشکەوتنی هەندێ کۆمەڵگەی کلاسیکدا، زۆرترین هەرەشە لەسەر گەشەکردنی ئابووری زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ وشکی و ناوەندیی بیرۆکراتی پاك نەك بۆ وشکی و ناوەندێتی بیرۆکراتی».[٤]

لەڕاستیشدا کاتێ دەزگەی بیرۆکراتی لاواز دەبێ گشت چالاکیە ئابوورییەکان کارتێکراو دەبن، لەناو ئەوانەشدا نارێکی ماف و ئەرکی هاوڵاتیان، لانی کەم ئەوەی پەیوەستە بەداهاتەکانی دەوڵەتەوە وەکو رەسم و باج کە لە ئەنجامی بڵاوبوونەوەی بەرتیل دەدەن لە کەمی.

٢ـ گەندەڵی باوەڕی هاوڵاتی بەکارایی یاساو پیرۆی گشتی لاواز دەکات و رێسایەکی بەهایی بەشوێن خۆیدا دێنێ، ئەو خراپەکاریانەی سوودی تاکیی بەرزدەکەنەوە باوە تێیداو، ناباوەکەشی ئەو چاکەکاریانەن کە لە هەمان کاتدا خزمەتی بەرژەوەندی تاك و کۆمەڵیش دەکەن.

٣ـ گەندەڵی لە بەکاری ئابووری و دابەشکردنی سامان و دەسهاتی نەتەوەیی بەشێوەیەکی دادوەرانە، کەمدەکاتەوە و دووبارە دابەشیان دەکاتەوە لە بەرژەوەندی ئەوانەی پایەو دەسەڵاتدارن، ئەوانەی بەدزیەوە دەوڵەمەند دەبن، دیارە گەندەڵی ئاشکرانییە بۆ زۆرینەی خەڵك. لێکۆڵینەوە مەیدانیەکانیش نەیانتوانی

دەرکەوتنەکانی گەندەڵی و گەندەڵکاران بەشێوەیەکی ورد بناسن، سەرەڕای بڵاوبوونەوەی لەناو دەزگە حکومیە بیروکراتیەکاندا لە وڵاتانی وەك زائیر ـــ نایجریا ـــ فلیپین، هند، بەنگەلادیش، ئەندونسیا، تایلاند، مەکسیك، هاییتی ... هتد. لەم ڕۆژگارەشماندا لە هەندێ لە وڵاتانی پڵنگانی ئاسیادا هەیە. هەندێ لە توێژینەوەکانیش دەریان خستوە کە ژمارەیەك لە حکومەتانی دەوڵەتانی گەشەسەندوو لە نێوان ٢٠ـــ١٠٠٪ زیاتر لە نرخە راستەقینەکان دەدەن بەهۆی بڵاوبوونەوەی دیاردەی پارەو بەرتیل وەرگرتن.

٤- گەندەڵی هۆی دیاردەی تێکچوونی پەیکەرە ئابوورییەکانە لە چەندین دەوڵەتی گەشەسەندوودا، چونکە هانی پرۆژە بێبەرەکان دەدات کە قازانجی زۆرو بەپەلەی تێدایە لەباتی ئەو پرۆژە بەرهەمهێنەرانەی کە بڕبڕەی گەشەسەندنی پاك و سەربەخۆن، واتە گەندەڵی دەبێتە هۆی بەفیڕۆچوونی دەرامەتەکان.

٥- لە هەندێ دەوڵەتی تازەپێشکەوتوودا گەندەڵی وەکو ئامرازێك بەکاردێت بۆ کڕینی ویژدان و وەلاّمی رامیاری بۆ رژێم کە بەرژەوەندییەکانی یەکتربڕن لەتەك بەرژەوەندی گەندەڵکاران و لە ئەنجامدا دەبنە هاوکاری راستەقینە بۆ ڕژێم. لە ئەنجامی ئەمەشدا نامۆبوونی سایکۆلۆجی دروست دەبێ بۆ توێژە فراوانەکانی کۆمەڵگە، لە کۆتاییشدا گەندەڵی دەبێتە هۆی کێشەی کۆمەڵایەتی و بار گۆڕانی رامیاری لەو دەوڵەتانەی تێیدا بڵاّودەبێتەوە.

بڵاوبوونەوەی دیاردەی گەندەڵیش لە ئاستەکانی کارگێری و رامیاری نایەڵێ بنچینەکانی گەشەپێدانی گشتگیرو سەربەخۆ لەنگەر بگرن، لەتەك گەندەڵیدا سەرچاوەی نوێ بۆ سامان دەردەکەوێ کە توێژی بیرۆکراتی و مشەخۆر وەکو قاچاخچی و دەڵاڵ سوودی لێدەبینن.

بەڵام بۆ گەندەڵی بڵاّودەبێتەوە تا ببێ بە دیاردە لە هەندێ دەوڵەتدا؟ لەوەیە بەسوودبێ گەر بیبەستینەوە بە دابەزینی ئاستی وەجێگەیاندنی ئابووری و کەمی



دەسهات کە پاڵ بەهەندێ کەسەوە دەنێت وەزیفەکانیان ناڕەوا بەکار بێنن دواتریش حەرام و حەلاڵیان لا پێچەوانە دەبێتەوە، لەوانەشە دیاردەی گەندەڵی بگەڕێتەوە بۆ نائامادەیی ئازادیە دیموکراتییەکان و لاوازی و نەکاری دامەزراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی، سەرباری نائامادەیی دامەزراوە یاسادانەرەکان یان بوار پێنەدانیان، یان لاوازی دامەزراوە دادگەییەکان یان لاوازکردنیان لە سێبەری نەبوونی بینراوەیی و لێپرسینەوەدا، هەروەها لاوازی پارتە رامیارییەکان و نەبوونی روحی رکابەری لە نێوانیاندا رۆڵی هەیە لە بڵاوبوونەوەی دیاردەی گەندەڵی و لەوانەشە هۆیەکەی گشت ئەمانە بن کە باسمان کردن.

یەکگرتویی ئایدیۆلۆجی یان ئینتمای نیشتمانی و پابەندی جەماوەری لە پشت ئەو هەڵسانەوەن کە لە چەندین دەوڵەتدا روویدا، بەلاّم نائامادەییان لەبەر هەر هۆیەك بێ لە چەندین وڵاتی دواکەوتوودا گەندەڵی کردە گرێبەستێك لایەنگرانی و سوودخوازانی کۆدەکاتەوە، ئەمەیە نالۆجیك، چونکە گەندەڵی لە دەوڵەتە پێشکەوتووەکاندا جیادەکاتەوە کەچی پێڕۆی رامیاری و ناوپۆشکەی و هاوکارانی یەك دەخات لە وڵاتە گەشەسەندووەکاندا. بەم هاوپەیمانیە ناپیرۆزە کابرای ڕامیاری خۆی و شوێنەکەی ئەگەرچی تاماوەیەك دەپارێزێت و لایەنگرانیشی تاماوەیەك سوود دەبینن.

گەندەڵی هەر جۆرێکی بێ رامیاری یان کارگێری، لە رووی ئەخلاقیەوە رەتکراوەیە، چونکە دەستدرێژیەکی پیس و ئاشکرایە بۆسەر رێسای بەها کۆییەکان، دووریش نییە لە هەناوی گەندەڵیدا بزاڤی چاکسازی لەدایك بێت و دادوەری و یەکسانی دروشمیان بێت و بەرگری دژی زوڵم بکەن و تێبکۆشن بۆ روخاندنی ڕژێمەکانی گەندەڵی تاهەتایە، ئەوەی لە ئەندونسیاو فلیبینیش روودەدات گەورەترین بەڵگەیە بۆ ئەمە.

## گەندەڵی چییە؟

بەخستنە ڕووی نووسینە ئابووری و کارگێڕییەکان چەند پێناسەیەکمان بۆ گەندەڵی دۆزییەوە، لەوانە:

- گەندەڵی واتە خراپ بەکارهێنانی دەسەڵات بۆ وەدیهێنانی دەستکەوتی تایبەتی.[٥]

- گەندەڵی بەکارهێنانی وەزیفەی حکومیە بۆ بەیاساکردنی دەسکەوتی تایبەتی، بەرتیل و ناچار کردنیشی تێدایە کە دەبێ دوولایەن بەشدار بن تێدا. هەندێ شێوازی گەندەڵیش هەیە یەك لایەن پێی دەکرێ وەك فێڵبازی و دزی.

- گەندەڵی ڕەوشتێکی بیرۆکراتی لادەرە ئامانجی وەدیهێنانی سوودی خودیە بەشێوازی ڕێپێنەدراو.

- بەقسەی هنتگتون گەندەڵی یەك لەو پێوەرانەیە کە نائامادەیی دامەزراوەی ڕامیاری لەکار دەردەخات، کە ئەم چەرخەمان دەیبینێ، بەپێی ئەو گەندەڵی تەنیا ئەنجامی لادانی ڕەوشت نییە لە شێوازە ڕەوشتیە پەسەندەکان، بەڵکو ئەنجامی لادانی خودی عورف و بەهاکانە لەو شێوازە ڕەوشتیانەی کە هەیەو ناسراوە.

- ئوستەر فیلدیش ئێژێ گەندەڵی گشت ئەو ئیشانەیە کە خەڵکانێك لە دەرەوەی دەزگەی حکومی دەیکەن و سوودیشی دەبێ بۆ فەرمانبەری گشتی، بەوەی کە ڕێیان پێدەدا خۆیان لە یاساکان و سیاسەتەکان بدزنەوە جا ئەگەر بەدارشتنی یاسای نوێێ یان بەهەڵوەشانی یاسادانراوەکان کە توانایان پێدەدا بۆ وەدستهێنانی دەسکەوتی ڕاستەوخۆ و بەپەلە. فەرمانبەرە حکومیەکان پێ لە هەندێ ئیش دەنێن سوودی بۆ خۆیان و خێزانەکانیان و هاوڕێکانیان هەبێ بەداواکردن یان وەرگرتنی



سوود لەو خەڵکانە بەرانبەر خزمەتی ڕاستەوخۆو بەپەلە بەداهێنان یان هەڵوەشانی یاساو سیاسەتەکان، بەمەش دەسکەوتی ڕاستەوخۆ وەردەگرن.[٦]

لە دوای خوێندنەوەی ئەو پێناسانە دەتوانین بگەینە ئەم پێناسە چڕەی گەندەڵی: گەندەڵی خراپ بەکارهێنانی دەسەڵاتە بەمەبەستی دەسکەوتی مادی بەسوود لە کاتی نائامادەیی دامەزراوەی ڕامیاری بەکاردا لەتەك لاوازی ـ چاودێری کۆمەڵگەی مەدەنی، هەروەها تێپەڕاندنێکی ئاشکرای یاساکانەو دەستدرێژیە بۆسەر ڕێسا بەهاییەکان و پێوەرە ئەخلاقیەکان.

لە زاراوەی گەندەڵیش ئاماژەدەکرێت بەتاوانەکانی بازرگانی کردن بە وەزیفەی گشتی یان دەسدرێژی بۆسەر دارایی گشتی.

ئەوەیش پەیوەستە بەباشی یان خراپی گەندەڵیەوە دەوەستێتە سەر بارودۆخ، لەوانەیە لە دۆخێکدا وەزیفی بێ لە دۆخێکی تردا وەزیفی نەبێ، یان ئاشکرابێ لەو دەوڵەتانەی بەبینراوەیی ئیش دەکەن و شاراوەبێ لە دەوڵەتە گشتگیرەکاندا.

## میکانیزمەکانی بەگژاچوونەوەی گەندەڵی

ئیللا هەر دەبێ بەشوێن میکانیزمی پێشکەوتوودا بگەڕێین بۆ بەگژاچوونی گەندەڵی و ئابلۆقەدانی و نەهێشتنی بەدواداهاتووەکانی لە مەودای کورت و درێژیشدا بەگوێرەی پاچینەی پێشخستنەکان. هەندێ لە ناحەزانی گەندەڵێ ئێژن قاپی بەگژاچوونی گەندەڵی، گەشەپێدانێکی ئابووری گشتگیرو سەربەخۆیە، هەندێکی تر پا لەسەر دانانی وەلا بۆ دەوڵەت و نەتەوە لە شوێن پەیوەندی ئێتنی و عەشایەری و ئاینزایی دادەگرن، هەشە وایدەبینێ کە پێویستە ڕۆڵی چینی ناوەڕاست بەکار بخرێ بۆ بەگژاچوونی گەندەڵی.

بەگژاچوونی گەندەڵی وەکو پێویست دەسەڵات و زەبری یاساو پراکتیزەکردنی هاوهەڵی ئیشکردنی گەرەکە بۆ بەشدار بوون لە بەرزکردنەوەی بەها نمونەییەکان لە کۆمەڵگەدا وەکو پاکی، خۆنەویستی، ئەمانەت، قوربانیدان و دانانی گشت لە سەرووی تایبەتەوە، سەپاندنی هەیبەتی یاساش هاوکاتبێ لەتەك ڕێسایەك لە هاندان وەك کرێ و پاداشت، هاوڕێش بێ لەتەك سزای تیژ بۆ تاوانکاران و ئەوانەی بێخەمن و کار پشگوێ دەخەن، هەر بۆ زانین توندڕەوی لە جێبەجێکردنی یاساو بەرزکردنەوەی دەقەکانی لە سێبەری بیرۆکراتی حکومیدا لەوەیە خزمەتی ئەو کەسانە بکات کە خۆیان واناو دەبەن کە خەمخۆری یاساو سەلامەتی پێڕۆی گشتین.

لە گشت بارێکیشدا ئەگەر هاولاتیان هۆشیار کرانەوە لە ماف و ئەرکەکانیان، ئەگەر درکیان بەڕاستی و پتەوی و پاکی جێبەجێکەرانی یاسا کردو کرۆکی یاساو ئامانجەکانیان ناسی، ئەوە بێگومان رووبەری گەندەڵی دەکشێتەوە تا بەتەواوی نامێنێ.

بینراوەییش وەکو یەك لە مەرجە رامیارییەکانی گەشەپێدان لە ولاتە گەشەسەندووەکاندا تووشی کوسپ دەبێ، لە ئەنجامی زەحمەت دەسکەوتنی زانیاری لەبارەی دیاردەی گەندەڵی و ڕووداوەکانی بلاودەبێتەوە لە سێبەری لاوازی توانا کارگێڕییەکان و فشولّی دەزگە چاودێریەکان.

ئەوەش پەیوەستە بەلێپرسینەوە وەکو میکانیزمێکی پێویست بۆ بەگژاچوونی گەندەڵی، ئەوە ئەمیش ڕووبەڕووی کێشەی قوورخکردنی هێز دەبێتەوە لەلایەن ئەوانەی بەتەنیا خۆیان دەستدەگرن بەسەر دەسەڵاتی ڕامیاریدا، یان ئەوانەی بەپارە خۆیان قایم دەکەن لە سێبەری لاوازی و نەکاری دامەزراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنیدا، سەرباری نەبوونی هێزی پەستان لە کۆمەڵگە گەشەسەندووەکاندا، خۆ ئەگەر هەبوایە بەگژی خراپییەکاندا دەچووەوە.



لێرەشدا پێویستە هەموو هۆیەکانی راگەیاندن بخرێتە پێش بەرپرسیە نشتمانییەکەیان هەتا بەشداربن لە گۆڕینی ئاراستەکانی ڕای گشتی لەو دەوڵەتانەی دیاردەی گەندەڵیان تێدابلاوە. ئائەمە بوو کە بریتانیا کردی لەدوای سەدەیەك لە حوکمی گەندەڵی، هەروەها هونگ کونگ و سەنگافورایش بەم شێوە توانیان تاڕادەیەك خۆیان لە گەندەڵی ڕزگارکەن. هونگ کونگ «دەزگەی سەربەخۆی بەگژاچوونی گەندەڵی» دامەزراند کە بەپاکی ناسرابوو و دەسەلاتی فراوانیشی هەبوو، توانیشی سەرکەوتنی باش وەدست بێنێ دوور لەو ئامانجە ڕمیاریانەی «بەگژاچوونی گەندەڵی» دەکەنە ئامرازێ بۆ پاکسازی حسابە رامیارییەکان، چونکە «بنەماکانی گەمەی ڕامیاری» لەنێوان پارتەکان و بزاڤەکان و ڕیکخراوە رامیارییەکان لە هەندێ ولاتی گەشەسەندوودا دەبێتە هۆی دروستکردنی ڕێسایەك لە پەیوەندی ناساق کە بەکاری دەسەڵاتی رەسمیو رۆڵی لە بەگژاچوونی گەندەڵیدا لاوازدەکات.

میکانیزمەکانی بەگژاچوونی گەندەڵی وای دادەنێت هەموو هۆکارە رامیاری و ئابووری و دەرەکی و ناوەکیەکان بەهەند وەربگیرێن، ئەوانە دەبنە هۆی بلاوبوونەوەی گەندەڵی لە کۆمەڵگەداو ئاست و پلەی ترسناکیەکەی بەئاستی پیادەکردنی دیمۆکراتی یان نەبوونی دیاریدەکرێ، دیارە لە هەرکوێ ئازادی ڕادەربڕین و هەڵبژاردنی ئازاد هەبێ، لە هەرکوێ دامەزراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی بەکاربن، ئەوە ڕووبەری گەندەڵی دەکشێتەوە لە بەرژەوەندی پێرۆی گشتیدا. لێرەدا هەندێ کەس لەوەیە رەخنەمان لێبگرن، چونکە هەندێ دەوڵەتی جیهانی سێیەم هەیەو ژیانی دیمۆکراتیان تێدا هەیە وەکو هند کەچی ڕزگاریان نەبووە لە دەست گەندەڵی، ئەمە ڕاستە بەلام پەیوەندی نێوان دامەزراوە دیمۆکراتییەکان و گەندەڵی تارادەیەکی زۆر پشت بەو بارودۆخە رامیاری و ئابووریە

دەبەستێ وا وڵاتی پێدا تێپەڕدەبێت و لەوانەیە ئاسانکاری بکا بۆ پەڕاوێزێکی دیاریکراو لە گەندەڵی یان بەشدار بێ لە نەهێشتنیدا.

بەگژاچوونی گەندەڵی وەکو سەرەتا پێویستی بەم کۆمەڵە هەنگاوانە هەیە :

- چاککردنی دامەزراوە حکومیەکان و رێکگرتنی (ضبط) ئیشەکانی کەرتی تایبەنی.
- پایەدارکردن و پاکڕاگرتنی دەزگەی دادگەیی و بەکارخستنی رۆڵی (دەسەڵاتی چوارەم) رۆژنامە.
- چاککردنی پێرۆی باج و دارایی و رێگرتن لە خۆدزینەوە لە باج.
- رێکگرتنی چالاکی کۆمپانیا فرەناسنامەکان وا گەندەڵیان کردۆتە ئامرازێك بۆ گرێدانی پرۆژەنامەی گومان لێکراو لە وڵاتە گەشەسەندووەکاندا.
- لێپرسینەوەی توندوتیژ بۆ گەندەڵکاران و لایەنگرانیان.

لەمەی ڕابورد ئەو مەترسیانەی لە گەندەڵیدا هەیە بەتایبەت لەسەر پرۆسەی گەشەپێدان بەگشتی و لەسەر بەشینەوەی دادپەروەرانەی دەسهات لەنێوان هاوڵاتیان بەتایبەتیی، بۆمان روون دەبێتەوە، بۆ ئەوەی پرۆسەی گەشەپێکردنی ئابووری خێراتر بڕوات و ئاستی ژیانی هاوڵاتیش باشتربێ، ئیللا دەبێ کرمی گەندەڵی ریشەکێش بکرێ، بەهاوکاری بنیاتنەری نێوان ئەو بەرپرسە رامیاریانەی لەڕاستیدا ئارەزووی چاکسازی ئابووری و کارگێڕی دەکەن و لە نێوان ئەو هاوڵاتیانەی سەر بە نیشتمان و نەتەوەکەیانن و سەربە هیچیتر نین، لەرێی رێکخراوە رامیارییەکان و سەندیکا پیشەییەکان و رێکخراوە میللیەکان و بەرە نیشتمانییە پێشکەوتووخوازەکان، بێگومان ئەم هاوکاریەش بەری دەبێ لە بنیاتنانی رێسایەکی بەهایی کۆمەڵگەیی کە رەوایەتی و ئارامی پێرۆی رامیاری پایەدار بکات و



هەیبەت و زەبری یاساش دەچەسپێنێ. حوکمەکانی یاساش دەبێ تیژبن بەرانبەر گەندەڵبووان و گەندەڵکاران دوور لە هەندێ لێدەرکردن، کە ئەگەر بەردەوامبێ دروشمی «بەگژاچوونی گەندەڵی» دەبێتە هەڵواسراوێك و لە سێبەریدا سەرپێچی و تاوانکاری و دەسدرێژی کردنە سەر پیرۆزییەکانی یاسای گشتی ڕوودەدەن، لە حاڵەتی ئاوهاشدا قسەکردن لەسەر نەهێشتنی گەندەڵی لە بابەتی گەمەو گاڵتەو کات بەفیڕۆدانە.

گەندەڵی ڕامیاری لە هەموو جۆرە پێرۆ ڕامیارییەکاندا بەپلەی جیاواز هەیە، ئەگەرچی هەندێ کەس لە قەبارەی کەم دەکەنەوە لە دەوڵەتە دیمۆکراتییەکاندا گەورەشی دەکەنەوە لە دەوڵەتە گشتگیرەکاندا، خەریکیشە کەس لاری لەوە نەمینێ کە گەندەڵی بووە بەدیاردەیەکی درێژخایەن زۆربەی وڵاتە گەشەسەندووەکان چ دیمۆکراتی و چ نادیمۆکراتییەکانیش بەدەستیەوە دەناڵێنن، هۆکارەکانیشی پەیوەستن بەگەندەڵی ڕامیاری یان بەسیاسەتی گەندەڵکردنەوە.

## پەیوەندی نێوان دیمۆکراتی و گەندەڵی

ئەگەر دیمۆکراتی مانای ئازادی و یەکسانی و بەشداربوون بێ، ئەگەریش مەبەستی دەسەڵاتی گەل و ڕێزگرتنی ماف و ئازادییەکانی مرۆڤ و پەیڕەوی پێرۆی گشتی و جیاکردنەوەی هەرسێ دەسەڵاتەکە بێ، ئەگەر مانای دیمۆکراتی گشت ئەمانەو شتی تریش بێ، وەکو سەرەتا وادادەنرێ دیمۆکراتی و گەندەڵی لە پەیوەندیەکی بەشەڕ هاتوودا بن، واتە لەبەرئەوە دیمۆکراتی ڕێسایەکی بەهایی کۆیی تێدایە ئیللا هەر دەبێ لە پەیوەندییەکی پێچەوانە دابێ لەتەك گەندەڵی. واتە چەندە ڕووبەری دیمۆکراتی فراوان بێتەوە ڕووبەری گەندەڵی دەبێ بکشێتەوە، ئەگەریش ڕووداوەکان بەو ئاقارەدا بچوایەن، ئەی بۆ ئەو وڵاتانەی لە مێژە پەیڕەوی دیمۆکراتی دەکەن بەدەست گەندەڵی وە دەناڵێنن؟ ئەی بۆ لەدوای هەڵوەشانی ڕژێمە گشتگیرەکان و گواستنەوەی وڵاتەکانیان بۆ ئابووری بازاڕو کەوتنە شوێنی بریقەی دیمۆکراتی بورجوازی، ڕووبەری گەندەڵی فراوان بووەوە.



سەرەڕای ئەوەی کە دیمۆکراتی ڕەگەزێلێکی لە ناخدایە شایەنە بەرپیشەکێشکردنی گەندەڵی وەکو:

- هەڵبژاردنی پاك و ئازاد بۆ دەسەڵاتداران و گۆڕینەوەی دەسەڵات لە نێوان پارتەکاندا.
- هەبوونی دەسەڵاتی یاسادانانی بەکار.
- هەبوونی دەسەڵاتی جێبەجێکردن کە دەسەڵاتی زۆری پێداوە.
- هەبوونی دەسەڵاتی دادگەیی سەربەخۆ سەرباری ڕای گشتی ڕۆشنبیر.

پرسیاریش ئەمەیە ئایا ئەم ڕەگەزانە بەس نین بۆ پاراستنی پێرۆ دیمۆکراتییەکان لە پەتای گەندەڵی، ئەم پێرۆیانە چیان پێویستە پتر لەم بنەمایانە کە لە دەسەڵاتی گەل و ئازادیە گشتییەکان و فرە حزبییەوە وەرگیراوە بۆ ئەوەی بەدەست گەندەڵی وە نەناڵێنن کە لەسەر بنەمایەکی ناپیرۆز لە نێوان دەسەڵات و پارەدا پەیرەو دەکرێ؟ ئەی بۆ دەسەڵات لە سێبەری دیمۆکراتیدا دەبێتە قوورخکردنی هێزو، بۆچی پارە دەبێتە شەوەیەك و خەوی ڕامیارکەران تاڵ دەکات و بڕیاری ڕامیاری و ئابووری سەربەخۆیان لەدەست دەرەکات؟

لەوانەیە وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە پێویست بەچونە ناو ناخی ناوەڕۆکی دیمۆکراتییەوە بکات و میکانیزمەکانی بخرێنە ژێر وردبین، بۆ نیشانکردنی لایەنە لاوازەکانی دیمۆکراتی، کە بۆتە داواکارییەکی جەماوەری دوورو نزیك داوای دەکات. زۆریش دەترسین لەوەی دیمۆکراتی بەتاڵ بکرێتەوە لە ناوەڕۆك وەکو ئەو دروشمانەی پێشتر خرانە ڕوو وەکو سوشیالیزم و یەکێتی و ڕزگاری، ئەنجامەکانیش هەند دوورە دەستبوون ئومێدمان پێیان نەما. ئەو عەیبوو ناتەواویانەش دەلکێنە دیمۆکراتییەوە هۆیەکەی پیادەکردنی ناڕاستە کاتێ دەنگدەرەکان لەژێر پەستانی

هێزی ڕامیاری پشت بەستو بە  پارە نوێنەری باش هەڵنابژێرن. سەرەڕای ئەوەی کە دیمۆکراتی وەکو پێرۆیەکی ڕامیاری لەسەر بەشدارکردنی گەل وەستاوە لە حوکمداو وایان لێدەکات بەئازادی و بەبێ پەستان نوێنەرەکانیان هەڵبژێرن، واتا زۆرینە حوکم بگرێتە دەست و کەمینەش پابەندی بڕیارەکانی بێت. ئاریشەکە لێرەدا، نیشانەکانی دیمۆکراتی نییە لە گۆڕینەوەی ئاشتیانەی دەسەڵات لە سێبەری یاساوە بیگرە بەئازادی و پاکی هەڵبژاردن و ڕێزگرتنی مافەکانیدا برۆو تا دەگەیتە ئازادی دامەزراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی و هۆیەکانی بەیەکگەیشتنی جەماوەری ـ ئاریشەکە ـ لە پیادەکردنی دیمۆکراتیدایە، ڕاهاتنی خەڵکیش لەسەر دیمۆکراتی بەشەو ڕۆژێك ڕوونادات، بەڵکو کاتی زۆر دەوێت بۆ گواستنەوە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان کە هەمیشە هاوڕێیە لەتەك هەندێ شێوازی گەندەڵی ڕامیاریدا، کە فرە جۆرو فرە ڕەنگ دەبێت و تەسك و فراوان دەبێتەوە بەپێی قووڵایی دەستکەوتە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان، ئەمیش ڕەنگدانەوەی باشی هەردەبێ لەسەر بونیادی ڕێسای بەها کۆییەکان.

گەندەڵی ڕامیاری وەکو شێوازێك لە شێوازەکانی ڕەوشتی ڕامیاری کە بەرپرسی حکومی بەبێ گوێدانە یاساکان و پێرۆ کارپێکراوەکان دەیکات بۆ دەستکەوتنی سوودی مادی یان مەعنەوی بۆ خۆی، ئەوە ئەم تایبەتیانەی هەیە:

١- پیادەکردنی ئەرکەکانی وەزیفەی گشتی بەشێوازێکی بیرۆکراتی بەگوێرەی پێوەرو ڕێککگری دیاری کراو.

٢- سەرپێچی کردن لە بنەما ڕێکخەرەکانی وەزیفەی گشتی.

٣- وەدەسهێنانی سوودی تایبەتی لە سەرپێچی کردنی گشتی.

٤- دانانی بەرژەوەندی تایبەتی لە سەرووی بەرژەوەندی گشتییەوە.



٥- هەبوونی دوو دیو لە هاوکێشەی گەندەڵیدا، فەرمانبەری حکومی و داواکاری خزمەت.[٧]

بەدیاری کردنی ڕوکارەکانی گەندەڵی ڕامیاری، شارەزایانی بەڕێوبردن لەم سێ ئاستەدا پۆلینیان کرد:

**أ ـ گەندەڵی سەرۆکایەتی:** ئەم جۆرە لوتکەی هەرەمی ڕامیاری دەگرێتەوە، واتە ئەو سەرۆك و فەرمانڕەوایانەی دەسەڵاتەکانیان بەکاردەهێنن بۆ وەدەسهێنانی سوودی تایبەتی. ئەم جۆرەش ترسناکترین جۆری گەندەڵییەو لە هەندێ وڵاتانی ئەفریقا و ئاسیا و ئەمریکای لاتینیدا بلاوە، تۆمارگەی هەندێ سەرۆکیش پڕە لە تاوانکاری دارایی و ناڕەوا بەکارهێنانی دەسەڵات و دەوڵەمەند بوون بەشێوەی ناڕەوا. هەر بۆ نموونە سەرۆکی پێشوتری هایتی «جان کلور دوڤالییە» ٤٥٠ ملیۆن دولاری لە گەنجینەی دەوڵەتی دزی و بەفڕۆکەکەی رایکرد بۆ تاراوگە، بەر لە راکردنەکەشی نزیکەی ٥٠٠ ملیۆن دۆلاری لە بانکە بیانییەکاندا هەبوو. ئەم بڕە پارەیەش هیچ نییە لەچاو ئەو دزیەی کە مارکۆسی سەرۆکی پێشوتری فلیپین کردی، بەرلەوەی رابکا CIA سامانەکەی بەنزیکەی ٣ ملیار دۆلار دەنرخاند، ئەمەش یەکسان بوو بەنیوەی بودجەی گشتی فلیپین، ڕاپۆرتەکانیش وایان باسەکرد کە سامانەکەی مارکۆس لەنێوان (١١ـ٣٠) ملیار دۆلاردایە.

لە مەکسیکیش کە نموونەیەکی ئاشکرای گەندەڵی رامیارییە زۆربەی قەرزە دەرەکییەکانی گواسترانەوە بۆ حسابی گەورە بەرپرسانی ئەو وڵاتە لە بانکە بیانییەکاندا. سوهارتوی ئەندونیسیاش کە نزیکەی ٣٢ ساڵ حوکمی کرد خۆی و خێزانەکەی وەکو پەند دەهێنرێنەوە لە قورخکردن و زاڵبوون و خزمایەتی و هەواداری.

ئائاوهاش کورسیی سەرۆك لە خزمەتی بەرژەوەندی گشتییەوە دەگۆڕدرێت بۆ کۆکردنەوەی سامان و ناڕەوا بەکارهێنانی دەسەڵات و وەرگرتنی پارەو بەرتیل،

زۆربەی ئەو سەرۆکانەش سەر بە جیهانی سێیەمن، چونکە ماوەی حوکمەکەیان تارادەیەك درێژە و بواریان پێدەدات گەمە بەچارەنووسی وڵات بکەن و دەرامەتەکانی بەفیڕۆبدەن و سامانەکانی بدزن. ئەمەو گەندەڵی رامیاری کەسی سەرۆکەکان تێدەپەڕێنێت و دەگاتە ژن و منداڵەکانیان و هاوڕێکانیان و ناسیارەکانیان، بەگۆڕینی هێماکانی گەندەڵی و لادانیان و دادگەیی کردنیان نەبێ، گەندەڵی ریشەکێش ناکرێ.

**ب ـ گەندەڵی دامەزراوەیی:** ئەمەیان گەندەڵی هەندێ لە ئەندامانی هەرسێ دەسەڵاتەکە دەگرێتەوە، ترسناکترینیان گەندەڵی وەزیرەکان و گەورە بەڕێوبەرەکان و نوێنەری پارتە رامیارییەکان و ئەندامانی پەرلەمانە، وەکو کێشەی «نوێنەرانی قەرزەکان» کە لەم دوایەدا خرایە بەردەم دادگەی میسری و چوار پەرلەمانتارو وەزیرێکی پێشوو لە پارتی نیشتمانی فرمانڕەوا بەگەندەڵی بانکی تاوانبارکرد، چونکە ئاسنکاری بانکیان وەرگرتبوو دەگەیشتە ١ ملیار جونەیە [٨]. لە ترسناکیشدا، لەدوای گەندەڵی پەرلەمانی، گەندەڵی وەزاری دێت کە دەتوانرێت ئاشکرا بکرێت بەنیشانکردنی ئاستی ژیانیان، ئایا بەرزترە لەو موچەی وەریدەگرن؟ لەوەیشە هێڵەکانی گەندەڵی دامەزراوەیی بچنەیەکدا وەکو هاوپەیمانی گەندەڵکارانی وەزاری لەتەك گەندەڵکارانی پەرلەمانیدا.

گەندەڵی وەزاریش نارەوا بەکارهێنانی وەزیرەکان بۆ دەسەڵاتەکانیان پیشانەدا لە وەدەسهێنانی سوودی تایبەتی رێپێنەدراو، حکومەتیش لەوەیە کەشی گەندەڵی بقۆزێتەوە بۆ تەزویری هەڵبژاردنە پەرلەمانییەکان، لەوکاتەشدا ئەندامی گەیشتوو بەپەرلەمان بەرێگای پێچاوپێچ زۆرتر ئامادەی نارەوا بەکارهێنانی دەسەڵاتە و مەیلی زورترە بۆ گەندەڵکاری. گەندەڵی حزبیش تێپەڕاندن و لەقکردنی حزبەکانە بۆ بنەماکانی گەمەی رامیاری وەکو سیخوڕی لەسەر بەرهەڵستکار و داپڵۆسینی، سەرباری بەکارهێنانی دەسەڵات لەلایەن بژاردە رامیاری و حزبییەکانەوە بۆ وەدەسهێنانی



دەسکەوتی تایبەتی رێپێنەدراو وەکو بازرگانی بەشمەکی خواردەمەنی لە بازاڕی ڕەشداو بەشینەوەی ئەو شمەکانەی کەمن لە بازاڕدا بەسەر خزم و هاوڕێ و ناسیاراندا.

ئەندامانی گەندەڵی دامەزراوەییش بەردەوام دەبن لەسەری تا لەسەر ئەوکارەبن کە دەیانپارێزێ لە سزاو لێپرسینەوە، وەکو ئەوەی لە سوریا روویدا لە کێشەی پەتشلکردنی سەرەك وەزیران مەحموود ئەلزوعبی و جێگرەکەی سەلیم یاسین و وەزیرەکەی موفید عەبدولکەریم بۆ پیاوی کاری سوری مونیر ئەبوخزور، کە لە کێشەی پرۆژەنامەی کڕینی شەش فڕۆکەدا تووشبون لە کۆمپانیای (ایر باص)ی فرەنسی لە کۆتایی ١٩٩٦ کە بایی ٢٥٠ ملیۆن دولار بوو، ئەوانە دەسەڵاتەکانیان بەکارهێنا بۆ ناچارکردنی دامەزراوەی گشتی فڕۆکە بۆ ئیمزاکردنی گرێبەندێك لەتەك کۆمپانیای ناوبراودا بەمەرجێلێك کە ناگونجێ لەتەك سادەترین گرێبەنددا، زیانی ئەوەش لە بەرژەوەندی گشتی گەیشتە ملیۆنان دولار [٩].

**ج ـ گەندەڵی کارگێڕی:** ئەمەش فەرمانبەری بیرۆکراتی لە ئاستەکانی ناوەڕاست و خوارووی هەرەمی کارگێڕیدا دەیکەن. زۆرجاریش لە کێشەی گەندەڵی بچووك تێناپەڕێ کە دوولایەن پێی هەڵدەستن داواکاری خزمەت و فەرمانبەری حکومی، بۆ ئاسانکردن و تەواوکردنی ئیشوکاری لایەنی یەکەم، لایەنی دووەم بەرتیل وەردەگرێ لەژێر ناوی «رێزلێنان» و «بەخشین» لەوانەشە هەندێ دیندار ناوی چاکەی (حسنە) لێبنێن، چونکە تۆزێ دەستهاتی فەرمانبەر زیاد دەکات. بەگژاچوونی ئەم جۆرە گەندەڵیەش ئاسانە بەئاسانکردنی یاسا کارگێڕییەکان و توند جێبەجێکردنی و چاودێری کردنیشی سەرباری زیادکردنی موچەی فەرمانبەران بۆ ئەوەی پاکانە نەبیننەوە بۆ سەرپێچیکردنی پێڕۆی گشتی.

## میکانیزمەکانی بەگژاچوونەوەی گەندەڵی رامیاری

پرۆسەی چارەکردنی گەندەڵی رامیاری و نەهێشتنی شوێنەواره روخێنەرەکانی لە ژیانی ئابووری و رامیاری دەوەستێتە سەر سروشت و بەکاریی میکانیزمە بەکارهێنراوەکانی بەگژاچوونیدا، لەوانەش:

١- **گۆڕینەوەی دەسەڵات:** واتە گواستنەوەی دەسەڵات لە پارتی فەرمانڕەواوە بۆ پارتە بەرهەڵستکارەکان بەپێی قورسایی رامیاریان لە کۆمەڵگەداو، بەرنامە رامیاری و ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانیان کە ڕەنگدانەوەی بەرژەوەندی و ئارەزووی هاوڵاتیانە لە وڵاتە دیموکراتییەکاندا کە نەحکومەتی هەمیشەیی و نەبەرهەڵستکاری هەمیشەییان تێدایە، چونکە دەسەڵات دەگۆڕنەوە بەگوێرەی ئەنجامی هەڵبژاردنە گشتییەکان. کارکردن بەم سەرەتایەش دیاردەی گەندەڵی گەلێ سوك دەکاتەوەو لە سنووره بچووکەکانیدا ئابلۆقەی دەدات، چونکە پارتی فەرمانڕەوا ئەگەر گەندەڵکاری بکات لەو پارتە دەترسێ کە دوای خۆی دێتە سەر تەخت و گەندەڵکارییەکان دەخاتە بەردەم خەڵك. چاکەی گۆڕینەوەی دەسەڵاتیش ئەوەیە کە دروسبوونی گروپی گەندڵکار و بەرژەوەندی تەسك بەمانای فراوانی ئەم وشەیە زەحمەتە.

گۆڕینەوەی دەسەڵاتی رامیاریش خوێن تازەدەکاتەوەو کەشی ڕامیاریش دەژێنێتەوە بە رکابەری جوامێرانە لە نێوان بژاردە رامیارییەکان کە لە کێبڕکێدان بۆ سەلماندنی پاکی و دڵسۆزیان لە خزمەتی گەلدا، دوور لە بەکارهێنانی دەسەڵات بۆ خزمەت بەرژەوەندییە تەسکەکانیان و، ئەگەر پارتی فەرمانڕەواش لە پەیمانەکانی پەشیمان بووەوەو بەرنامەکانی جێبەجێ نەکردو بە ڕێگەی گەندەڵیدا رۆیشت ئەوە گران لە سەری دەکەوێت و دەبێ کرێکەی بدات، کاتێ دەنگدەران دەنگ بەپارتێ دیکە دەدەن کە ئاڵای بەگژاچوونی گەندەڵی بەرزدەکاتەوە، لەوەیشە حکومەتی گەندڵکار



پێش ماوە دستورییەکەی بروخێ، مێژووش پڕە لە نموونەی روخاندنی ئەو حکومەتانەی کە گەمە بە چارەنووسی خەڵك دەکەن.

بەڵام کێشەکە لەو وڵاتانەی گۆڕینەوەی دەسەڵاتیان تێدا نییە ئەوەیە حکومەتەکانیان ماوەیەکی زۆر دەمێننەوە و لە سێبەریاندا تیشکۆکانی گەندەڵی لانە دەکەن و بازنەکانیان تا بێت پانتر دەبنەوە تا ئەو ڕادەی تێچوی نەهێشتنی زۆر گران دەبێ، سەرباری ئەوەی کە گەندەڵی دەبێتە هۆی بەفیڕۆدانی دەرامەتەکان و دزینی سامانەکان و داکشانەوەی ئاستەکانی گەشەپێدان. حکومەتە گەندەڵکارەکانیش لە لێپرسینەوە ناترسن، چونکە دەزانن کەس ناتوانێ بیان دۆزێتەوە بەهۆی زۆری مانەوەیان لە حوکمدا. سەرەڕای ئەوەش ئەگەر هاتوو حکومەتێکی پێگەیشتووی پاك هاتە سەر تەخت، ئەوە زوو یان درەنگ گەندەڵکاران لە دەستی دادوەری دەرناچن.

٢- **سەروەری یاسا:** بنەما فقهییەکانی ئەم میکیانیزمە وایدادەنێن کە یاسا لەسەرووی هەمووانەوەیە حاکم بێت یان حوکمکراو، دەسەڵاتیش پابەندە بەپەیڕەوکردنی یاساو باش جێبەجێکردنی بۆ دابینکردنی دادوەری و پاراستنی بەرژەوەندییەکانی دەوڵەت و دامەزراوەکانی، واش دادەنرێت کە هەموو خەڵك دەبێ ملکەچی یاسا بن لە هەموو ڕەوشتەکانیاندا، ئەگەرنا حوکم دەبێتە خۆسەپاندن و دکتاتۆری ئەوجا هێزی دەسەڵات و هێزی پارە خۆیان گیردەکەن لە بەرژەوەندی خەڵك، بنەماکانی دەوڵەتی یاساش ئەمانەن:[١٠]

- ڕێزگرتنی دەستوورو کارکردن بەبەندەکانی بەتایبەت ئەوانەی پەیوەستن بە چۆنێتی هەڵبژاردنی حاکم و سنووری دەسەڵاتەکانی.

- بنەما یاساییەکان ڕێکبخرێ بەشێوەیەك گەورەیی هەندێکیان و شوێنکەوتوویی هەندێکیان بۆ هەندەکەی تری تێدا دەرکەوێ.

– چاودێری دادگەیی لەسەر جێبەجێکردنی یاسا، ئەمەش بەبێ سەربەخۆیی دادگە ناکرێت.

– ملکەچبوونی دەزگەو دامەزراوەکانی دەوڵەت بۆ یاسا. نابێ ئیدارە هەر ئیشێ یان بڕیارێ دەربکا لەتەك دەقی یاسادا نەگونجێت، ئەگەر یاسا پێشێل کراو ڕێزی نەگیرا ئەوە دەوڵەت لە دەوڵەتی یاساوە دەگۆڕێ بۆ دەوڵەتی پۆلیسی، دەسەڵاتیش ئازادی تەواوی دەبێ لەوەی چی بکات بەخەڵکی وڵات و چ ئیشێ بکات لەتەك ئامانجەکانی خۆیدا بگونجێ.

بێگومان سەروەری یاساو دادانەوەی حوکمەکانی لەسەر بەرپرس و هاوڵاتی بەبێ جیاوازی، نایەڵێ گەندەڵی بڵاوبێتەوە و ببێ بەدیاردە و ژیانی خەڵك و بەرژەوەندییەکانیان تێك بدات و هەتا گەندەڵیش نەبێ بەگشتی پێویستە دەستی دادگا واڵا بکرێت لە لێپرسینەوەی گەندەڵکاراندا.[١١] بەڵام لە واقعی هەندێ دەوڵەتانی جیهانی سێیەمدا گەندەڵی دەگاتە خودی دادگەو خاوێنی و دادوەرییەکەی لە دەسدەدات و دەبێتە ئامرازێك بەدەست حکومەتەوە بەپێی ئارەزوو یاسا دادەنێت بۆ تاوانکاری و پرۆژەنامە گومانلێکراوەکان و سزای کێشەی گەندەڵکاری بچووکیشی پێدەدەن ئەوانەی سەربەخۆییان نییە.

**٣- ئازادی و خاوێنی هەڵبژاردنە گشتییەکان:** ئازادی خۆپاڵاتن و هەڵبژاردن ناوەڕۆکی سەرەکی دیموکراتییە، لە پێڕۆ دیموکراتییەکاندا وەکو سەرەتا ئەوەی زۆرینەی دەنگ وەدەسنەهێنێت و جێی بڕوای خەڵك نەبێ لە هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی و پەرلەمانییەکاندا نایباتەوە. لەبەرئەوە هەڵبژاردنە گشتییەکان لەسەر دەنگدانی ئازاد وەستاوە، ئەو کەسەی خەڵك پێیان زانی کە گەندەڵکاربووە ئەوە جارێکی تر دەنگی پێنادەن، بۆیە سەرتای هەڵبژاردنی خاوێن و ئازاد



گرنتییەکی بنچینەییە لە نابەردەوام بوونی دیاردەی گەندەڵی کە نیشانکردی و چاودێری کردنی مافی پەرلەمانە بە :

– مافی پرسیارکردن لە ئەندام پەرلەمانەوە بۆ هەر وەزیرێك لە هەر بابەتێك بەگوێرەی پسپۆری خۆی، زۆرجاریش ئامانجی ئەو پرسیارکردنە ئاگادارکردنەوەی وەزیرەکەیە لەو هەڵەو تاوانکاریانەی لە چوارچێوەی ئیشەکەیدا ڕوویداوە [١٢].

– کۆڵینەوە لە سیاسەتی حکومەت و ڕاگۆڕینەوە لەسەر هەندێ ڕای گشتی. مەرجیشە هەندێ ئەندام پەرلەمان داواکاری پێشکەش بکەن بۆ وتووێژ، ئەم شێوازەش یارمەتی ڕاگۆڕینەوە دەدات لە نێوان هەردوو دەسەڵاتی یاسادانان و جێبەجێکردن[١٣].

– کۆڵینەوە لە هەبوونی هەڵە یان گەندەڵی لە هەندێ دەزگەی حکومیدا، بەدانانی لوجنەیەك بۆ لێکۆڵینەوە لە بابەتی وروژێنراو، ئەو لوجنەیەش ڕاپۆرتێك ئامادەبکات و بیخاتە پێش پەرلەمان بۆ وەرگرتنی بڕیاری پێویست، ئەو لوجنە پەرلەمانیەش بۆی هەیە داوای قەواڵە بکات و گوێبگرێ لە قسەی فەرمانبەران و شایەت بانگ بکات بۆ دۆزینەوەی ڕاستی. بەم شێوازە چاودێرییەش دەسەڵاتی یاسادانان زانیاری مەیدانی پەیدا دەکات لەسەر دەسەڵاتی جێبەجێکردن و یارمەتیان دەدات بۆ ڕاستکردنەوەی هەڵەکان و خۆلادان لە عەیبەکان، ئەمەش ڕەنگدانەوەی باشی دەبێ لەسەر بەرژەوەندی گشتی.[١٤]

– وەڵام وەرگرتن: دەسەڵاتی یاسادانان بۆی هەیە سەرەك وەزیران یان هەر وەزیرێك تومەتبار بکات لە کاروباری گشتیدا، وەڵام وەرگرتنیش لۆمەکردن و ڕەخنە لە سیاسەتی حکومەت دەگرێتە خۆ، لەوانەشە بگاتە ڕاگرتنی متمانە لە حکومەت یان لە هەندێ لە وەزیرەکان. واتە لێپرسینەوەی حکومەت ئامرازێکی چاودێری بەکارە بەدەست دەسەڵاتی یاسادانانەوە بەسەر دەسەڵاتی جێبەجێکردن.

- باوەڕکێشانەوە ئەمەش کاتێ ڕوودەدات لێپرسینەوەی حکومەت یان چەند ئەندامێکی بکرێت لە کێشەیەك کە پەیوەندارییێت بە سیاسەتی گشتی دەوڵەتەوە، ڕنگیشە تاکی بێت یان کۆیی. ئەگەر لێپرسینەوەکە تایبەت بێت بە سیاسەتی گشتی حکومەتەوە یان بە سەرەك وەزیران ئەوە لێپرسینەوەیەکی کۆییمان لە پێشدایە کە هەموو حکومەت دەگرێتەوەو دەبێ بەهۆی دەست لەکارکێشانەوەی حکومەتەکە، ئەگەریش لێپرسینەوەکە پەیوەست بوو بە وەزیرێکەوە ئەوە لێپرسینەوەیەکی تاکیمان لە پێشدایەو یاساش بوار دەدات بەراگرتنی باوەڕپێدان بەو وەزیرە ئەگەر وەزیرەکانی تر هاوکار نەبوون، لەم حاڵەتەشدا واجوانە حکومەت دەست لەکاربکێشێتەوە.

بەم شێوەیەش ئازادی و پاکی هەڵبژاردن چ لە ئاستی خوجێی یان گشتی بێگومان سەرکردەی خاوێن و بەتوانا دێنێتە کایەوە کە ڕێ لە گەندەڵی بگرێت لە هەموو ئاستەکانیدا.

**٤- مافە مەدنی و رامیارییەکان:** لە جاڕی جیهانی مافی مرۆڤ کە ساڵی ١٩٤٨ دەرچوو، ڕێکەوتنی دەوڵەتی مافە مەدەنی و رامیارییەکان کە ساڵی ١٩٦٦ ئیمزاکرا، باس لە مافەکانی هاوڵاتی کراوە بەبێ هیچ جیاوازییەك وەکو: یەکسانی تەواو، دادگەی خاوێنی سەربەخۆ تەماشای کێشەکانیان بکات، گشت کەسێکیش مافی ئازادی بیرکردنەوەو دەربڕینی هەیە، هەمووانیش مافی پاراستنیان هەیە لەلایەن یاسایەوە و تا دوایی لە مافە مەدەنی و رامیارییەکان کە لە جاڕی جیهانی مافی مرۆڤدا هاتووە.[١٥]

گومانیشی تێدا نییە ڕێزگرتن لە مافە مەدەنی و رامیارییەکانی هاوڵاتیان بەگرنتییەکی بنچینەیی دادەنرێت بۆ بەگژاچوونی گەندەڵی و ڕێگرتن لە تووشبوونی بەرپرسەکان لە پرۆسەی گومانلێکراودا.



**٥- کۆمەڵگەی مەدەنی:** کۆمەڵگەی مەدەنی بەدامەزراوە حزبی و سەندیکایی و پیشەییەکانیەوە ناوەڕۆکی ڕاستەقینەی ژیانی دیمۆکراتی پێکدەهێنێت، مافی بەڕێوەبردنی کاروباری وڵات بەزۆرینە دەدات و بەکەمینەش مافی بەرهەڵستکاری و ڕادەبڕین لە گشت کێشەکانی وڵاتدا.

پارتە رامیارییەکانیش وەکو یەك لە گرنگترین دامەزراوەی کۆمەڵگەی مەدەنی رۆڵێکی گەورەیان هەیە لە نیشانکردنی دیمەنەکانی گەندەڵی و بەگژاچوونیدا بەو ئەرکە رامیاری و ئابووریانەی بۆ کۆمەڵگەی دەکەن وەکو [١٦]:

١- پێگەیاندن و ڕوناکبیرکردنی ئەندامەکانی و پێدانی ئەو زانیارییە ئابووری و رامیاری و ڕوناکبیریانەی کە گەشە بەهۆشی رامیاریان دەدەن.

٢- بەتواناکردنی گروپەکان لە دەربڕینی بڕواو ئارەزووەکانیان بەشێوەیەکی ڕێکخراوی بەکار.

٣- پارتە بەرهەڵستکارەکان ڕۆڵی چاودێری دەبینن لەسەر پارتی فەرمانڕەوا.

٤- حزب هەلی هەڵبژاردنی ئەندامانی پەرلەمان و حکومەت بۆ خەڵك دەرەخسێنێت و وا لە جەماوەر دەکات توانای هەڵسەنگاندنی سیاسەتە جیاوازەکانی هەبێ.

٥- فرە حزبی یارمەتی پاداشت دانەوەی بەرپرسە باشەکان و لێپرسینەوەی بەرپرسە خراپ و گەندەڵکارەکان دەدات.

ئەگەریش حزبەکانی وڵات هاوکاربوون لە وەدەسهێنانی گەشەپێدانی ڕامیاری ئامانجدار کە بەهای وڵات و هاوڵاتی بەرزدەکاتەوە، ئەوکاتە ئابلوقەدانی گەندەڵی و نەهێشتنی شوێنەوارە ڕوخێنەرەکانی ئاسانە بەبەشدارییەکی کاریگەر لە ژیانی

رامیاریداو بە ئاراستەکردن و ڕۆشنکردنەوەی ڕای گشتی تا بزانێ کام مەسەلە بەرژەوەندی وڵاتی تێدایەو کامیان دژێتی.

هەبوونی فرە حزبیش مانای دیاریکردنی ئامانجە رامیارییەکانی حکومەتە لەدوای یەك هاتووەکانە، ڕەقترین سزایش گەل ئاراستەی حزبە گەندەڵکارەکانی بکات باوەڕ پێنەدانەو ئەویش ناتوانێ جارێکیتر بگاتەوە حوکم، سەرباری ئەو سزا یاساییانەی بۆ ئەو مەبەستە دانراون ئەگەر بەتەواوی جێبەجێکران.[١٧]

لە واتاکانی فرە حزبیش چاودێریکردنی حزبەکانە بۆ یەکترو دۆزینەوەی هەڵەی یەکتر، ئەمەش یارمەتی ناسینی ڕاستیو بەرگریلێکردنی دەدات، واتە حزبەکان ڕۆڵی چاودێری ڕامیاری دەبینن بەسەر حکومەتەوە هەتا تاکڕەو گەندەڵکار نەبێ.

سەرباری حزبەکان کۆمەڵگەی مەدەنی گروپەکانی بەرژەوەندیشی تێدایە کە توانای تەکنیکی بەرزیان هەیە بۆ دۆزینەوەی لادانەکانی حکومەت و دیاری کردنی ئاستی گەندەڵییەکەی. بەم ڕێگەیەش دامەزراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی یارمەتی چاندنی ئەو بەها کۆیانە دەدەن کە پێداویستی و داواکاری گەشەپێدانی ئابووری پڕ دەکەنەوە. سەرباری ئەوەی کە دەبن بە کەلەبچە بەسەر ڕەوشتەکانی حکومەت و چۆنیەتی جوڵانەوەو چالاکییەکانی ڕێکدەگرن و یاسای بۆ دادەنێن.

**٦- هۆیەکانی ڕاگەیاندن:** لە گرنگترین ئامرازەکانی چاودێری جەماوەرییە لەسەر دەسەڵات و دەزگا کارگێڕییەکان و چەکێکی بەکاریشە بۆ دۆزینەوەو بەگژاچوونی گەندەڵی. گرنگترین هۆی ڕاگەیاندنیش ڕۆژنامەیە کە پێشی دەوترێت «دەسەڵاتی چوارەم»، لە گرنگی هۆیە بینراوو بیسراوەکانیش کەم ناکەینەوە لە بەگژاچوون و ئاشکرا کردنی گەندەڵیدا. لە ڕێگەی ئەم هۆیانەشەوە هاوڵاتی دەتوانێ ڕۆڵی خۆی وەجێبێنێ لە دۆزینەوەو نەشاردنەوەی عەیب و خراپەکان، هەروەها دەشتوانێ شوێنی نارێکییەکان لە هەڵسوکەوتی حکومەتدا دیاری بکات.



هۆیەکانی پەیوەندی جەماوەری بەتایبەت ڕۆژنامە خەم و سکالای هاوڵاتیان نیشان دەدات و بەشوێن کاری دامەزراوەکانی دەوڵەتدا دەچێت و ئەو سەرپێچی و تاوانکاریانەی ڕوودەدەن دەردەخات و قسەی بەرپرسان بڵاودەکاتەوەو شیان دەکاتەوەو قسەیان لەسەر دەکات[١٨].

ڕۆڵی ڕۆژنامەش لە کارامەکردنی جەماوەردا بۆ چاودێری هەڵسوکەوتی حکومەت لە دوو لایەن خۆی دەبینێتەوە و یەکەمیان چاودێری کردنی بەکاری بەڕێوەبردنە حکومیەکان بەرەخنەگرتن لەو ڕەوشتانەی زیان بەبەرژەوەندی خەڵك دەگەیەنن. دووەمیشیان هۆشیارکردنی ڕامیاری و ئامادەکردنی ڕای گشتی بۆ ڕێگرتن لە بڵاوبوونەوەی گەندەڵی و ناساندنی وێنەکانی، بێگومان هۆیەکانی ڕاگەیاندن ناتوانن ڕۆڵی خۆیان لە بەگژاچوونی گەندەڵیدا ببینن ئەگەر ئیشکردنەکەیان بە ئازادی و لە چوارچێوەی ئەخلاقەکانی پیشەی ڕاگەیاندندا نەبێ.

بەگوێرەی ئەمەی ڕابردوو بۆ ئەوەی گەندەڵی نەبێتە جیاوك بۆ هەندێ گەورە بەرپرس و بۆ ئەوەی گەندەڵی لە خۆیدا نەبێتە بەهاو نەبێتە شێوازی ژیان، پێویستە هەموو توانا خێرخوازەکانی کۆمەڵگە هەڵبسێنرێت بۆ بەگژاچوونی گەندەڵی و شوێنپێ کەوتن و ریشەکێشکردنی کاروانی ئەوانەی وڵاتیان تێکدا.

ئەمەش بەوەکارخستنی دامەزراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی و زاڵبوونی یاسا نەبێ نابێ. لە کۆتاییشدا هیچ ڕژێمێك ناتوانێت داوا لە خەڵك بکات پابەندی یاسا بن ئەگەر خۆی پابەندی دەق و ڕۆحی یاسا نەبێ.

هاوڵاتیانی وڵاتە گەشەسەندووەکان بەهیوای ئاستێکی ژیانی باشترن ڕزگاریان بکات لە ناڵێن و زۆر لێکردن، ئەوەش بەژیرێتی حوکم دەبێت کە دەگاتە بینراوەیی و لێپرسینەوە، پێگەیشتوویی حوکمیش چەند ڕەگەزێکی تێدایە لەوانە: سەرکردایەتی ڕامیاری، ئارامی ڕامیاری، ئامانەت، سەروەری یاسا، پێرۆ، جێی باوەڕ بوون، تەکنۆلۆجیاو شیکردنەوەی ڕەخنەیی. بینراوەییش یەکێکە لە گرنگترین ئەو مەرجانەی کە دەتوانێت چارە پێشکەش بکات و ڕۆشنایی بخاتە سەر نارێکی لە کاری پێرۆ رامیارییەکاندا. سەرکردایەتی ڕامیاریش گرنگترین ڕەگەزی گەشەپێدانەو بەبێ ئەو بینراوەیی و لێپرسینەوەو پێگەیشتوویی حوکم وەدینایەت بەتایبەت ئەگەر جەماوەر لە دەوری کۆبووەوە هەر کەسەو یەك دەنگ وەکو هێمایەك بۆ دیموکراتی و پشتگوێخستنی ئەم سەرەتایەش بێئومێدی دەڕوێنێ لە دەروونی خەڵکدا.

بینراوەیی بەمەسەلەیەکی تەوەری دادەنرێت لە پرۆسەی گەشەپێداندا و بەتەنیا سەرپەرشتی خەرجی گشتی تێدا نییە، بەڵکو مولەت دەدا بەو خەرجیە بەشێوازێکی ڕاست. ئەگەر حکومەتیش نەیتوانی وابکات ئەوە مانای نەبوونی بینراوەییەو دەوڵەتیش ناتوانێ بەبێ لێپرسینەوە پێشکەوتن وەدەستبهێنێ تا ئەو ڕادەی ئەو دەوڵەتانەی چنگ لە لێپرسینەوە گیردەکەن و کاری پێدەکەن تەنگژە ئابووریەکان بەشێوەیەکی کاتی نەبێ کاریان تێناکات.

دوژمنی سەرەکی بینراوەییش گەندەڵیە، بەڵام گەندەڵی کەی دەبێ؟ گەندەڵی وەکو سەرەتا ڕامیاری بۆگەندەکات و پلانەکانی گەشەپێدان لەباردەبا، بەڵام ئەوەی گەندەڵییە لە کولتوورێکدا لەویە لە کولتوورێکی دیکەدا وانەبێ، بەچاوپۆشینیش لە ڕێژەی تێڕوانین بۆ گەندەڵی زۆربەی دەوڵەتان بەدەستیەوە دەناڵێنن، دەوڵەتیش



نییە پێشکەوتووبێ یان گەشەسەندوو پارێزراو بێ دژی گەندەڵی، پەندیش لەرێگە چارەکەیدایە کە لێپرسینەوەی تیژی بەرتیلدەرو بەرتیلخۆری تێدایە، هەتا ئەگەر ئەو بەرتیلەش لە شێوەی بەخششیدا بوو، چونکە فەرمانبەر جیاوازی دەکات لەنێوان ئەوەی دەیداتێ و ئەوەی نایداتێ و داوای زیاتریش دەکات. ئەم کردارانەش نایاساییە ئەگەرچی لەلایەنی ئەخلاقیەوە لە هەندێ کۆمەڵگەدا بەخراپی دانانێن، واش دادەنرێ فەرمانبەر جگە لە موچەو ئەو پاداشتانەی کە پێرۆکان بواری پێ دەدەن، هیچی تر وەرنەگرێ.

کاتی گەندەڵی باو دەبێ لە کۆمەڵگەدا فەرمانبەر داوای بڕە پارەیەك دەکات لە داواکاری خزمەت بەرانبەر خزمەتێك خۆی بەخۆڕاییە، ئەمەش شێوە ناچارکردنێکە بۆیە واپێویست دەکات لەسەر فەرمانبەر ساڵانە بەڵگەنامەیەك پێشکەش بکات بەو بڕە پارەی لە ئەستۆی دایە بۆ دڵنیابوون لە باشی ڕەوشتە وەزیفییەکەی تا نەتوانێ جگە لە دیاری تایبەتی، پارە یان زندەماڵ وەربگرێ، وەکو بنەمایەکیش دیاری بەخشین لەتەك ئەوانەی سوود لە کارەکەی وەردەگرن قەدەغەیە لەسەر فەرمانبەر.

لە بەرانبەریشدا پێویستە فەرمانبەر دەسهاتێکی هەبێ لە هەژاری و کەوتنە بەر چنگی گەندەڵی بیپارێزێ. گەورە بەرپرسانیش بپارێزرێن لە فریودانەکانی گەندەڵکردنی بیانی، سا بە وێژدان کڕین بێ یان بەوەکارهێنانی بریقەی پارە، یان بەپیشاندانی سیحری دەسەڵات. کۆمپانیا دەرەکییەکانیش لێزانن لە کڕینی بەرپرسە گەورەکانی دەوڵەت و ئەمانیش زیادەڕۆن لەسەر وەرگرتنی بەرتیل لە سێبەری نائامادەیی بینراوەیی و لێپرسینەوەو شلوشاوی لە پراکتیزەکردنی یاسا کارپێکراوەکانی دەوڵەت. بەداخیشەوە کە هەندێ پارت و بزاڤی ڕامیاری هەن لە بەرنامەکانی پێش هەڵبژاردندا پەیمان دەدەن، کە شەڕ لەتەك گەندەڵیدا بکەن، بەڵام هەر کە بوون بە فەرمانڕەوا خۆیانیش گەندەڵکار دەبن، ئەوەش سەرنج ڕاکێشە کە

له چەندین دەوڵەتدا حکومەتەکان دەگۆڕێن و کەچی گەندەڵی بەردەوامە لە ئەنجامی هاوپەیمانییەکی رانەگەیەنراو لەنێوان فەرمانبەرە گەندەڵکارەکان و ئەوانەش لەوانەیە هاوپەیمانی ببەستن لەتەك دەسەڵاتدا بۆئەوەی ئەو بۆشاییانە پڕنەکرێنەوە، کە لێیەوە گەندەڵکاری دەکەن.

لێپرسینەوەو بینراوەیی تاڕادەیەکی زۆر دەوەستنە سەر جۆری سەرکردایەتی رامیاری و ئەو سیفەتە باشانەی تێدا هەن وەکو قوربانی دان، خۆبەخت کردن، کەرامەت، بەتەنگەوەچوونی جێبەجێکردن و رێزگرتنی یاسا لەلایەن خۆیان وەکو پێشەنگ لە سەرەتاداو دواتریش لەلایەن هاوڵاتیانەوە. بۆئەوەی لێپرسینەوەش دوورابییەکانی خۆی وەربگرێ و ئامانجەکانی وەدیبێنێ، دەبێ حکومەت و دامەزراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی لە هاوکارییەکی ڕاستەقینە دابن بۆ پێگەیاندنی ڕای گشتی بەرگر لە گەندەڵی، بەبەرزکردنەوەی دروشمی نیشتمانی و نەتەوەیی کە کولتووری «سەر بە وڵات بوون» پتەو بکات و پابەندبێ بەکێشەکانی نیشتمان و نەتەوەوە وەکو «بەڕاستگۆیی ئیش بکەو لەپێناوی راستیدا تێبکۆشە» هەروەها وروژاندنی جۆش و هەستی نیشتمانی هەلی گەندەڵکردن لە ناوخۆو دەرەوەشدا لە دەست گەندەڵکاران دەردەکات.

بەکاری بینراوەیی و لێپرسینەوەش دەوەستێتە سەر پەلەکردن لە کێشە کەتنکارییەکان لە ماوەیەك ئەوپەڕی شەش مانگ بێت، تەنانەت ئەگەر پێویستیشی کرد بەیارمەتی بیانی، هەروەها بەکاری بینراوەیی گرێبەستە بە سروشتی دەسەڵاتی یاسادانانەوە ئەمیش نابێ تووشبووانی کێشەی گەندەڵی لەناودابێ وەگەرنا دەستدرێژکەرانی سەر یاسا دەبنە یاسادانەرو زۆر جاریش دەسەڵاتی دادگەیی دەکەوێتە ژێر فشاری ئەو گەورە بەرپرسانەی دەس وەردەدەن لەپێناوی لێبوردن لە سەرپێچیکەرانی یاسا، ئەگەریش تاوانبار لە چنگی دادگە بەبێ سزا دەرچوو ئەوا زیاتر دەڕوا لەسەر سەرپێچی کردنەکان



دوای ئەوەی گەیشتە قەناعەت کە دەسەڵاتی یاسا بووەتە بوکەشوشەیەك بەئارەزووی خۆی یاری پێ دەکات.

سەروەری یاساو جێبەجێ کردنی بەندەکانی بەبێ لێدەرکردن چەسپاوترو بەکارتر دەبێ لە سێبەری بینراوەیی و لێپرسینەوەدا، کۆمەڵگەش نییە لە دەرەوەی یاسا وەگەرنا دەبێتە شەریعەتی باخ، وەکو لە بیری ڕامیاریشدا هاتووە مرۆڤ لە بنەوانەدا بەپێی پەیمانی کۆمەڵایەتی وازی لە ئازادیە سروشتییەکەی هێنا بۆ وەدەسهێنانی ئازادی مەدەنی، شکاندنی یاساش دەستدرێژییە بۆسەر پەیمانی کۆمەڵایەتی، وەلێ بیرۆکەی یاسا ئەم پرسیارە پوچەڵ ناکاتەوە. بەکام یاسا کۆمەڵگە حوکم بکرێت؟ ئاسمان و ڕێسمانە ئەو یاسایەی دەربڕی کۆمەڵگەیە لەتەك ئەو یاسایەی دەربڕی دەستەیەکی خەڵکە. لە حاڵەتی یەکەمدا کۆمەڵگەو یاسا، گونجاون و لە حاڵەتی دووەمیشدا دژوەستاون. لێرەوە گرنگی دیمۆکراتی دەردەکەوێت وەکو باشترین کەش بۆ وەدەسهێنانی یەکێتی لەنێوان یاساو کۆمەڵگەدا. خەڵك بە سەروەری یاسا حوکم دەکرێن و ملکەچی یاسایەکی ستەمکار نابن کە لەوەیە کەشی گەندەڵی ئامادە بکات و لە ڕاستوێژی لێپرسینەوە کەم بکاتەوە.

ئا ئاوهاش گەندەڵی هەروەکو هەژاری سەنعەتێکی مرۆییەو مرۆڤەکان خۆیان دەیکەن، دەوڵەتە هەژارەکانیش بەهەژاری دەمێننەوە، چونکە هەستی پێ دەکەن و لە گێلێتییەکەیان بەئاگا نایەنەوە بۆ بەگڕخستنەوەی دەرامەتە سروشتییەکان و توانا مرۆییەکان و چاك کردنی وەبەرهێنان دوور لە کاری بێهوودەو دوور لە گەندەڵکاری بەئاگا یان بێئاگا. گەلان و حکومەتانی وڵاتانی گەشەسەندوو لەسەریانە زانست و تەکنۆلۆجیا وەدەست بێنن، چونکە ئەوانە هەروەکو بەهرەو داهێنان و کاری دڵسۆزانە، موڵکی کەس نین و هەمووانیش هەمان بیست و چوار سەعاتیان هەیە لە ڕۆژێکدا، ئەی بۆ دەوڵەتە پێشکەوتووەکان لە کاری بەسوود و

بەبەرهەمدا بەکاریدەهێنن، ئێمەش لە ولاَتە تازە پەرەسەندووەکاندا کات و توانا بەفیڕۆ دەدەین !

حوکمی باش و ژیرێتییەکەی بەتایبەتیگەلێك جیادەکرێنەوە خۆیان لە بینراوەیی و لێپرسینەوەدا دەبینینەوە وەکو ڕەگەزگەلێکی گرنگ پێرۆی ڕامیاری ڕەوایەتی و ئارامییەکەی لێوەردەگرێ، هەروەها توانای لەسەر باش وەبەرهێنان و دابەشکردنی دەرامەتەکان بەشێوەیەکی هاوتاو دادپەروەرانە.

بەلاَم گەندەڵی ڕامیاری و کارگێری ئاماژەیە بۆ خراپی حوکم و نارێکی پێرۆی ڕامیاری، بەڵکو بەوەکارهێنانی دەرامەتە گشتییەکان لە خزمەتی بەرژەوەندی تایبەتدا یان دانانیان لەژێر دەستی بێگانەدا، دەبێتە تەگەرەیەکی سەخت لەڕێی وەدەسهێنانی گەشەپێدانی بەردەوامدا.

چییەتی بینراوەیی چەند پرسیارێکی رەوا دوروژێنێ، ئایە پەیوەندی نێوان بینراوەیی و حوکم پەیوەندییەکی پێچەوانەیە؟ واتە ئەگەر لێپرسینەوە نەمێنێ یان خاوبێتەوە، گەندەڵی بلاَودەبێتەوە و دواتریش حوکم خراپ دەبێ. ئایە پەیوەندی نێوان گەندەڵی و حوکمی ژیرانە پەیوەندیەکی پێکدادانیە؟ ئایا حوکم ئەنجامە بۆ گەندەڵی یان گەندەڵی ئەنجامی خراپی حوکمە، کامیان هۆکارەو کامیان ئەنجام؟ بۆ وەلاَمدانەوەی ئەم پرسیارانە واپێویست دەکات چەمکی حوکمی باش یان ژیرێتی حوکم دیاری بکەین.



## حوکمی ژیرانە چییە؟

ئەم زاراوەیە بڕێکی زۆر لە لێڵی و بەیەکداچوون و ناڕوونی لەخۆدەگرێ و لەلایەنی زمانەوە فرە لێکدراوەتەوە و تووشی تێکەڵییەکی زۆری کردو ساختەشی دا بەسەریدا، وەکو ئەوەی باسی لەو «فەرمانڕەوایەتیە» دەکرد کە لە وتەی «فەرمانڕەوایەتی بۆ کەس نییە خوا نەبێ» وەرگیرابوو، هەیە واباسی حکومەت دەکات کە هێمایە بۆ کەلەبچەو بەستنەوە، هەشە واپێناسەی حوکم دەکات کە «کێشەکانی تایبەت بەکۆمەڵگەو دەوڵەتە».

بەلاَم حکومەت ئەو میکانیزم و پرۆسەو پەیوەندی و دامەزراوە ئالۆزانەیە کە هاولاَتیان ئیشەکانیان پێدەکەن و ماف و ئەرکەکانیانی پێ پەیڕەو دەکەن[١٩].

حوکمی باشیش بەبەشداربوون، بینراوەیی، لێپرسینەوە و ڕێزگرتنی سەروەری یاسا دێتە دی لە کەشی پەیوەندییەکی سێ لایەنە لە نێوان دەوڵەت و کەرتی تایبەتی و کۆمەڵگەی مەدەنیدا. پەیوەندی نێوان لایەنەکانی ئەم سیانەکیەش بڕیار لەسەر چاك و خراپی حوکم دەدەن بە:

- دەوڵەت چوارچێوە ڕامیای و یاساییەکە دابین دەکات.
- کەرتی تایبەتی هەلی ئیشکردن دابین دەکات و قازانج وەدیدێنێ.
- کۆمەڵگەی مەدەنی بەشدار دەبێ لە بەکارخستنی ژیانی ئابووری و ڕامیاری.

## حوکم و جیهانگیری

حوکم باش بێ یان خراپ لە بۆشاییەوە ئیش ناکا، چونکە کاردەکات و کارتێکراویش دەبێ بە بونیادی باوی دەرەکی و ناوخۆش. جیهانگیری و ئەو گۆڕانکارییە رامیاری و ئابووری و عەسکەریانەی لەتەك خۆیدا هێنانی وەزیفەی دەوڵەتی قۆڵبەست کردو گواستنەوەی سەپاند لە ئابووری پلانڕێژیەوە بۆ ئابووری بازاڕ کە هەندێ کەس وەکو چوارچێوەیەکی گونجاو بۆ حوکمی ژیرانە تەماشای دەکەن، چونکە ئازادی ئابووری بینراوەیی و لێپرسینەوەی تێدایە. لێرەدا ئەم پرسیارە قوت دەبێتەوە، پەیوەندی ئابووری بازاڕ بەگەندەڵیەوە چییە ئایە پەیوەندیەکی پێچەوانەیە یان ڕاستەوانەیە، ئایە ڕێکەوتوون یان لە ململانێدان؟ ئایە کێشەکەش لە هەبوونی ڕێسایەکی دامەزراوەیی باشدایەو، هەڵسانی دەوڵەت بەڕۆڵی خۆی بەگوێرەی تواناکانی، سا لەلایەنی توانای ئابووری بازاڕەوە بێ لە وەبەرهێنانی دەرامەتەکان و تایبەتکردنی بەشێوەیەکی هاوتاو دادپەروەرانە، یان لەلایەنی بەکاری کۆمەڵگەی مەدەنییەوە بێ لە بەرزکردنەوەی بونیادی ئابووری و رامیاری و لە پیادەکردنی بنەماکانی «گەمەی ڕامیاری» لەسەر بنچینەیەلێکی پاك؟

کاتێکیش حوکم ڕێکدەخرێت و جێگیر دەبێ وادادەنرێ کە هاوکاریەکی ڕاستەقینە لە نێوان هەر سێ دامەزراوەکەی حوکمدا ڕووبدا «دەوڵەت، کەرتی تایبەت، کۆمەڵگەی مەدەنی» تواناکانیش یەکبخرێت[٢٠] بۆ وەجێگەیاندنی ئامانجەکانی گەشەپێدانی بەردەوام، بە ئامادەکردنی کەشی ڕامیاری و ئابووری و تەشریعی کە بەشدار دەبێ لە وەبەرخستنی دەرامەتە ئابووری و مرۆییەکان بەباشترین شێوەو سامان و دەسهاتیش دادپەروەرانە دابەش دەکات.

چاکی حوکم و بونیادەکەی چارەیەکی جادویی نییە بۆ گشت ئەو کێشە دەرەکی و ناوەکیانەی ڕووبەڕووی کۆمەڵگە دەبنەوە لەوانەش گەندەڵی لە هەر سێ سوچەکەی حوکمدا. ئەگەر گەندەڵی لە ناوەندەکانی پارت و بزاڤە رامیارییەکان و دامەزراوە



کارگێڕییە گشتی و تایبەتیەکاندا بڵاوبووەوە، کێ بۆی هەیە بەگژیدا بچێتەوە؟ وەڵامی ئەم پرسیارە پێویست بەپێداچوونەوەی چییەتی باشی حوکم دەکات کە ئەمە دەگەیەنێ «بەکار هێنانی هێز لە گشت دامەزراوەکانی دەوڵەتدا بەئامانجی ئاراستە کردن و زاڵبوون و بەزۆر کۆکردنەوەی چالاکییەکان بۆ خزمەتی کۆمەڵگە». گەر زانیمان بیری ڕامیاری هاوچەرخ لە سوچی پەیڕەوکردنی پرۆسەی ڕامیاریەوە تەماشای حوکم دەکات، واتە وەکو شێوازێك بۆ هەڵسوڕانی دەرامەت و کاروبارە گشتییەکان کە لە پسپۆڕی دەسەڵاتی ڕامیاریدایە کە چەمکەکەی لە چەمکی حوکم گشتگرترە، چونکە ئیشی دەسەڵاتی ڕامیاری پاراستنی پیرۆزی کۆمەڵایەتییە لەناو دەوڵەتدا سەرباری پیادە کردن و باڵبەستکردنی حوکم.

بۆیە چاکی و ژیرێتی حوکم لە هەبوونی ئەم سێ مەرجەدا وەدیدێت: لێپرسینەوە، ڕەوایەتی، بینراوەیی.

لە واتاکانی لێپرسینەوەش لێزانی پیادەکردنی قەڵمڕەو و کارتێکردن لەسەر حوکمکراوەکان، واتە دەربری پەیوەندییە لە نێوان دەسەڵاتی جێبەجێکردن و یاسادانان سەرباری گۆڕینەوەی دەسەڵات. دەبێ لێپرسینەوەش سزای تیژی گەندەڵکارانی بەشوێندا بێت.

ڕەوایەتیش واتە مافی دەوڵەت لە پەیڕەوکردنی دەسەڵات و قەڵمڕەوی لەسەر هاوڵاتیانی ئەمەشی لە پەیمانی کۆمەڵایەتیەوە وەرگرتوە، هەروەها ڕەوایەتی ڕەنگدانەوەی هاوکاری هاوڵاتیە لەتەك دەوڵەتدا بەپاندبوونی بەئەرکە وەزیفییەکانی و بەپیرۆی گشتی و ڕێزگرتنی یاسا، ئەگەریش گشت لایەك ئەرکی خۆی وەجێهێناو مافی خۆی وەرگرت، ئەوکاتە گەندەڵی دەبێتە شتێکی ناباو.

بینراوەییش کە لەژێر کاریگەری شۆڕشی پەیوەندی و زانیارییەکان لە نووسینە ئابووریو رامیارییەکاندا لەم ساڵانەی دوایدا قسەی زۆری لەسەر کراوە، ئەویش زۆر بەسادەیی واتە تێڕژان و زۆری زانیارییەکان و ئاشکرا وەرگرتنی لەڕێی هۆیەکانی

ڕاگەیاندنی خوێنراو و نووسراو و بینراوەوە، بەمەش هەر دیاردەیەکی کۆیی وەکو گەندەڵی بەئاسانی نیشان دەکرێ «هاوڵاتیانیش دەتوانن پەیوەندی بەبڕیاردەرە ڕامیاریو ئابووریەکانەوە بکەن».

بەڵام ئەگەر بنەماکانی بینراوەیی نەمێنێ ئەوە ناتوانرێت قەبارەی گەندەڵی دیاریبکرێت و بەشێوەیەکی ورد بەراورد بکرێ لەتەك کۆی بەرهەمهاتووی کۆمەڵایەتی، چونکە هەندێ دەوڵەت یاساگەلێك دەردەکەن بۆ باڵبەستکردنی بینراوەییی، بەبیانوی ئەوەی ئاشکراکردنی زانیارییەکان بۆ هەرکەسێ گەرەکیبێ زیان بەبەرژەوەندی گشتی دەگەیەنێ، بەڵام ئایە لە ڕاستیدا بوونی ئەم یاسایانە خزمەتی بەرژەوەندی گشتی دەکەن؟ هەندێ جار داواکاری گشتی ڕێگە بە بڵاوکردنەوە نادات لەبەر هەر هۆیەك بەگوێرەی تێڕوانینی خۆی. ئایە شاردنەوەی زانیارییەکان نابێتە هۆی بێدەنگ بوون لە گەندەڵی کە پێویستە بەهەموو هۆیەکان حەیای ببرێت؟ کەواتە بینراوەیی ئاشکراکردنی زانیارییەکانی دەوێ بۆ دۆزینەوەی ڕاستی، بینراوەییش وەکو سەرەتا کولتوورێکی کوییە بەشدار دەبێ لە پەیڕەوکردنی دیمۆکراتی بەشێوەیەکی گونجاو.

گومانیشی تێدا نییە کە خەڵك هەیە وەکو گشتێکی بەشنەکراو تەماشای پەیوەندی سێ لایەنەی نێوان «لێپرسینەوە ـ ڕەوایەتی ـ بینراوەییی» دەکات کە لەناو یەکدا مەرجن بۆ هەبوونی یەکترو وای دادەنێت کە هەبوونی ئەو پەیوەندییە ڕەنگدانەوەی باشی و ژیرێتی حوکمەو سلامەتی هەڵسوڕاندن پتەو دەکات لە ئاستەکانی یاسادانان و جێبەجێ کردن و ئابووری و ڕامیاریدا، بەڵام هەیە جۆرە گرێبەستێك نابینی لە نێوان بینراوەیی و حوکمی ژیرانەدا، چونکە لەوانەیە حوکم ئاقڵ بێ بەبێ هەبوونی لێپرسینەوە و بینراوەیی، لەوانەشە حوکمی باش هەبێ بەبێ لێپرسینەوەی بەرپرسە گەندەڵکارەکان، ئاماژەش دەدەن بە ئەزموونی کۆریا کە حوکمەکەی لە هەمانکاتدا بە ئاقڵی و گەندەڵیش ناسراوە.



## گەندەڵی و دادوەری

گەندەڵی و دادوەری لە دوو سەری دژبەیەکدان، لەهەر کوێ گەندەڵی بڵاوبێتەوە دادوەری دەکشێتەوە پێچەوانەش ڕاستە، چونکە گەندەڵی جیاوازی چینایەتی لە نێوان دەستەو توێژە کۆمەڵایەتییەکان قووڵدەکاتەوە بەتاوانی بەرتیل و دزی لە دامەزراوەکانی دەوڵەت ئارامییەکەی لاواز دەکات و دەبێتە هۆی ڕوخاندنی حکومەتەکەی. هەروەها گەندەڵی هۆیەکە بۆ وەدەسهێنان و پاراستنی دەسکەوتی مادی بۆیە، گەندەڵبووان دڕندانە ڕووبەڕووی هەر گۆڕانکاریەك دەبنەوە کە هەڕەشە بێ بۆ سەر دەسکەوتەکانیان.

وەلێ شیکردنەوەی ئەم دیاردەیە بەندە بە کولتووری ڕامیارییەوە واتە بەڕەوتی کۆمەڵایەتییەوە، کۆمەڵگەی هیندی وەکو نموونەیەك لەسەر نایەکسانی لە نێوان چینەکانی سەرەوەو خوارەوەدا بنیاتنراوە، هەژارە هندییەکان لە ژیانیاندا پشت بە دەوڵەمەندان دەبەستن، بۆیە بزاوتی کۆمەڵایەتی زەحمەتە بەحوکمی پەیوەندی پشت بەیەکتربەستن و شوێنکەوتوویی لە نێوان هەردوو چینەکەدا، سەرەڕای ئەو گۆڕانکارییە ئابووری و کۆمەڵایەتییە گوازراوانەی هیند دەیبینێ و لەوەیە یارمەتی شیکردنەوەو پاکانەی دیاردەی گەندەڵی بدات، وەکو هۆیەکی وەدەسهێنانی دەرامەت لەلایەن هەژارانەوە لەباتی پشت بەستنێکی تەواو بەدەوڵەمەندان، گەندەڵی لێرەدا بەباشی هەڵدەسەنگێنرێ، چونکە لەلایەك پێداویستی پڕنەکراوە دابین دەکات و لەلایەکی دیکەشەوە لە توندی پەستانی ڕامیاری کەمدەکاتەوە، لە کەشێکدا کە ئازادییەکانی تێدا ئامادە نییە سەرباری ئەوەی گەورە گەندەڵکارە بیرۆکراتییەکان لەوانەیە لە بەرژەوەندی گەشەپێداندا پارەکانیان وەبەربخەن، کەچی گەندەڵکارە بچووکەکان بازاڕ دەجوڵێنن و داواکاری لەسەر شمەکی خزمەتی و بەکاربرەکی بەرز دەکەنەوە.

بەڵام لۆجیك و واقعی حاڵ ئەم ڕەنگدانەوە باشانەی گەندەڵی دووپات ناکەنەوە، چونکە کارە گەندەڵییەکان دەرامەت لە دەست هەژاران دەگوێزێتەوەو زیان بە بەرژەوەندی زۆرینە دەگەیەنێ، بەڵکو گڕ بەردەدا لە ململانێی دابەشکردنی ناوەندەکانی قەڵەمڕەو. فەرمانبەری ناشارەزاش دەگەیەنێتە پلەی کارگێڕی بەرز، ئەمەش هەڵسوڕانی دامەزراوەیی لاواز دەکات. ئەگەر بواریش درا بە پەراوێزێکی دیاریکراو بۆ گەندەڵی دەبێ ڕێکەوتووبن لەسەری و هەردوولاش دانی پێدا بنێن، چونکە هەندێ کۆمەڵگە بواری جیاواز دەدەن بەگەندەڵی لە کەرتەکانی یەك کۆمەڵگەدا. هەلی گەندەڵی ڕەسمیش زیاد دەکا، کاتێ کۆمەڵگە بیروکراتی قەبووڵدەکات و وەکو حاڵەتێکی سروشتی لەتەکیدا دەژی.

بەچاوپۆشینیش لە پاکانەو بیانووەکان، گەندەڵی لەلایەنی ئەخلاقیەوە رەتکراوەیە جا لە ئاستە قەبووڵکراوەکانیدا بوو یان قەبووڵنەکراو، چونکە تەگەرەیەکی سەختە لەڕێی گەشەپێداندا.

## گەندەڵی و دیموکراتی

هەبوونی گەندەڵی ڕامیاری هەڕەشەیە بۆ سەر دیمۆکراتی و ئەو بەهایانەی تێیدایە وەکو دادوەری و یەکسانی و ڕێزگرتنی مافی خەڵکانی دی، بلاوبوونەوەی دیاردەی گەندەڵیش دیمۆکراتی لەم لایەنانەوە لاواز دەکات:

١- بلاوبوونەوەی دیاردەی ئەو ڕامیاریکارانەی نازناوی پیاوی کاریان هەیە، ئەوانەش گرنگی بە زۆرکردنی سامانەکانیان دەدەن پتر لە بەرنامە رامیارییەکانیان.



٢- پارتە رامیارییەکان کەشی فراوانی گەندەڵی دەقۆزنەوەو لە بازاڕدا بەشتیا وەردەگرن.

٣- فەرمانبەرە بچووکەکان دەبنە کرێگرتەی خاوەن هێزو دەسەلاتەکان.

٤- دەرکەوتنی ناوەندی هێزی شاراوەو ناڕەوا هەڕەشە لە بەها دیمۆکراتییەکان دەکات.

سەرەڕای ئەو خراپیانەی کەشی دیمۆکراتی دەیهێنێتە کایەوە، ئەو هێزە شاراوانەی تێدایە کە توانای خۆچاککردنی هەیە، تەنانەت لە حاڵەتی بلاوبوونەوەی دیاردەی گەندەڵیی رامیاری و کارگێڕیشدا، ئەگەرچی هێزە شاراوەکانی دیمۆکراتی لە تەقینەوە نایەن لە سێبەری هوشێکی رامیاری پێگەیشتوو و هەبوونی بەرهەڵستکارییەکی بەکارو رای گشتیەکی ڕۆشنبیردا نەبێ.

بلاوبوونەوەی گەندەڵی لە نەوەدەکانی سەدەی بیستەمدا لە ولاتانی ڕۆژئاوادا بۆ بەهۆی زیادبوونی گومان لەسەر چاکی و سوودی نموونە دیمۆکراتییەکە لە حوکمدا، سەرەڕای ناوزڕانەکانی گەندەڵیی رامیاری و کارگێڕیش هێشتا ڕای گشتی لە دەوڵەتە پێشکەوتووەکاندا رکیداوە لە ئەزموونە دیمۆکراتییەکەی پاراستووە، بەتایبەتی کە گەندەڵی لەم دەوڵەتانەدا نەبووە بەدیاردەو هەتا لە سنوورە بچووکە قەبوڵکراوەکانیدا بێ، توانای زاڵبوون بەسەریدا و نەهێشتنی شوێنەوارە لاوەکییەکانی هەیە. تێبینیش دەکرێ کە هەڵبژاردنە گشتییەکان هەلی گەشەکردنی دیمەنەکانی گەندەڵی ئامادە بکات لە ناوەندەکانی ڕامیاریکاران و پارتە رامیارییەکاندا کە لەوەیە هەندێ ڕەوایەتی پێبدەن. گرنگیدانی رای گشتی دەوڵەتە سەرمایەدارە پێشکەوتووەکان بەکێشەکانی گەندەڵی ئەنجامی ئەم هۆکارانەیە :

١- بێ بازاڕی ئابووری و ئەو شڵەژانەی دەیهێنێت لە تەرازووی هێزە کۆمەلایەتییەکان.

٢- بەیەکداچوونی هۆکارە ئابووری و رامیارییەکان کە توێژی مشەخۆری هێناوەتە کایەوە و دەبێتە هۆی چەسپاندنی سامان بەدەستی کەمینەو بەرهەمهێنانی هەژاری لەلای زۆرینە.

٣- دەرکەوتنی هێزێلێکی رامیاری کە لە ڕاستیدا شەڕی گەندەڵی دەکەن و دەیکەنە ناونیشان بۆ بەرنامە رامیارییەکانیان.

٤- تێچوی هەڵبژاردنەکان پێداویستی پارتەکانی زۆر کردووە بۆ پارە، یاساش لە هەندێ دەوڵەتی ئەورووپیدا وەکو ئەڵمانیا بواری بەپارتەکان داوە بۆ قەبوولکردنی یارمەتی و بەخشین لە کاتی هەڵبژاردنە گشتییەکاندا. زۆر جاریش رووبەری گەندەڵی پان دەبێتەوە کاتێ پرۆژەنامەی نهێنی مۆر دەکرێ لە نێوان بازاڕی رامیاری و کارگێڕی لەلایەك و لەلایەکیتر بازاڕی ئابووری و کۆمەڵایەتی. ئەم جۆرە پرۆژەنامانەش فرەجار گومانلێکراوو نائەخلاقین، چونکە داچۆڕینی دەرامەتەکان ئاسان دەکەن لە کەرتی حکومیەوە بۆ کەرتی تایبەتی، هەل پێکەوەنانی سامانی گەورەی ناڕەواش بۆ هەندێ کەس دەڕەخسێنن لەرێی گرێبەندو جیاوکەکانەوە.

شایانی باسە ئەوەی لە واقعی زۆربەی ولاتانی رۆژئاوادا باوە ئەوەیە هێزو دەسەلات لە دەستی دەزگە کارگێڕی و بیرۆکراتییەکاندا چەقی بەستووە نەك پەرلەمانەکان، چونکە ئەو دەزگایانە زاڵن بەسەر «دەوڵەتی یاسا» داو دەشیجولێنن، نموونەی «دەوڵەتی یاسا»[٢١]ش نەخشەیەکی بۆ خۆی دۆزیەوە لە کولتووری ڕامیاری کۆمەڵگە رۆژئاواییەکاندا کە لە ڕابوردووەوە هەندێ دامەزراوەی دیمۆکراتی بۆ بەجێماوە و دروستکراوی خۆی نییە، بەڵکو بەسەریدا سەپێنراوە بەتایبەت ئەڵمانیا کە جیاواز لە ئینگلتەراو فرەنساو دوور لە شۆڕش گۆڕانکاری رامیاری کۆمەڵگەیی لەسەرخۆی بەسەرداهاتووە. تێبینیش کراوە کە هەندێ کۆمەڵگەی رۆژئاوایی بەها دیمۆکراتییەکانی لە دەوڵەتەوە وەردەگرێ، لەم



کۆمەڵگایانەدا دەوڵەت بەرپرسە لە پێشکەشکردنی هەندێ خزمەتی کۆمەڵایەتی بۆ هەمووان بەبێ جیاوازی، ئەگەریش شڵەژانی ڕامیاری ڕوویدا ئەوە رای گشتی دەیگەڕێنێتەوە بۆ ڕامیاریکاران، واتە کەسەکان نەك بۆ دامەزراوەکان کە هەمیشە بەشوێن چارەیەکدا دەگەڕێن نەشیش بسوتێ و نە کەباب.

دەوڵەتی یاسا یان دەوڵەتی دامەزراوەکان باشترین دەربڕینە بۆ دیمۆکراتی بەڵکو پێش خودی چەمکی دیمۆکراتیش کەوتووە، ئەگەر زانیمان کاتێ گەندەڵی ڕامیاری بڵاو دەبێتەوە، دەسوەردانی دەوڵەت لە کاروباری گشتیدا زیاد دەکات ئەمەش ئاقڵێتی و چاکی حکومەت لاواز دەکات. کاتێ خزمەتەکانی دەوڵەت فراوان دەبێ و پرۆژە گشتییەکانی زۆر دەبێت هەردەبێ هەندێ دیمەنی گەندەڵی لەتەك خۆیدا بێنێ، بۆیەش شارەزایانی کارگێڕی پێشنیازی پێدانی هاندەر دەکەن بۆ پرۆژە گشتییەکان و کەرتی تایبەت لەلایەك و لەلایەکی تر لە سنووردانی بەرنامەکانی چاودێری کۆمەڵایەتی، ئەمەش هەلی گەندەڵی کەم دەکاتەوە بەتایبەت لە ولاتە گەشەسەندووەکاندا.

هۆکارەکانی گەندەڵی لەتەك ئەنجامەکان و چارەکانیدا بەیکدا دەچن، بۆنموونە دیاری کردنی بەرنامەی چاودێری کۆمەڵایەتی لە ولاتە گەشەسەندووەکاندا لەوەیە پاڵبنێن بەگەڕان بەشوێن جێگرەوە دا بۆ خزمەتە کۆمەڵایەتییەکان، لەوەیە ئەو جێگرەوەش وەرگرتنی بەرتیل بێت، هەروەها هەڵوەشانی دەزگای کارگێڕی بیرۆکراتی و سوککردنی ناوەندێتیە زیاد لە پێویستەکەی، لەوەیە دروست کردنی دەزگاو دامەزراوەی تر بسەپێنێ کە بواری گەندەڵی رامیاری زیاتر بکات، ئەزموونی هەڵوەشانی یەکێتی سۆڤێتیش گەورەترین بەڵگەی ئەوەیە.

بەڵام بەزیادکردنی هۆشیاری گشتی بەو مەترسیانەی لە گەندەڵیدا هەیە بەتایبەت شوێنەوارە روخێنەرەکانی لەسەر پرۆسەی گەشەپێدان، هەروەها دانانی یاساگەلێکی

توندوتیژ لە گشت ئاستەکاندا بەوەکارخستنی کۆمەڵگەی مەدەنی لە پەیڕەوکردنی چاودێری و لێپرسینەوەی دامەزراوەکانی دەوڵەتدا، ئەوە رووبەری گەندەڵی تا سنوورە بچووکەکانی دەکشێتەوە. سەرباری وەگەڕخستنی توانای پێویست لە ئاستی دەوڵەتیدا بۆ بەگژداچوونی گەندەڵی، لەم بارەوە نۆ دەوڵەتی ئەورووپی رێکەوتنیان مۆرکرد بۆ شەڕکردنی گەندەڵی. هەروەها دەوڵەتە ئەندامەکانی رێکخراوی گەشەپێدان و هاوکاری ئابووری پەیماننامەیەکیان مۆرکرد «دژی وەرگرتنی بەرتیل». پێشبینیش دەکرێ ئەو دەوڵەتانەی کەمتر گەشەدەکەن ئەم پەیماننامە مۆر بکەن.

بەگوێرەی ئەمەی ڕابورد بڵاوبوونەوەی گەندەڵی پرۆسەی بزاوتی کۆمەڵایەتی لاواز دەکات، چونکە لە بەرپرسە گەندەڵکارەکان ناپرسێتەوەو تانەیان لێنادرێ، لە ناوەندەکانی کۆمەڵگەشدا زۆرن ئەوانەی کە باکیان نییە لە هەرای ناو وڵات و تەنیا تەماشای ناوزڕانەکانی گەندەڵی دەکەن وەکو چۆن تەماشای شانۆگەریەك بکەن، چ پەیوەندیەکیان پێوەی نەبێ. تەنیا لەو سنوورەدا نەبێ کە بەرژەوەندییەکانیان کاتێکراوە بن، گوێش نادات بەرووداوەکانی چواردەوری جگە لەو خزمەتانەی کە دامەزراوە بیرۆکراتییەکان پێشکەشیانی دەکەن. ئەمەیە کە فراوانی دیاردەی گەندەڵیی رامیاری و بەردەوامبوونی شیدەکاتەوە لە هەندێ دەوڵەتدا، بەتایبەت تازەپەرەسەندووەکان لێرەدا گەندەڵی نایەڵی گەشەپێدان و لێزانی ئابووری وەدیبێن، چونکە لە تۆوەکانیدا خۆدزینەوە لە باج دەشارێتەوەو میکانزمەکانی دیمۆکراتی لاواز دەکات دواتریش هێزو دەسەڵاتی دەوڵەمەندان پتەوتر دەکات و ڕێژەی ئەوانەی لەلایەنی ئابووریو رامیارییەوە پەراوێزخراون زۆر دەکات، سەرباری بەفیڕۆچونی داراییە گشتییەکان.

خراپ بەکارهێنانی وەزیفە کە لەم ساڵانەی دواییەدا چەندین حکومەتی لاداوە لە وڵاتە پێشکەوتووەکان و گەشەسەندووەکانیشدا، بەیەك لە دیمەنەکانی گەندەڵی دەژمێردرێ، ئەم حاڵەتەش لەو وڵاتانەدا زۆر بووە کە بە قۆناغی گواستنەوەدا تێدەپەڕن لە ئابووری پلانرێژەوە بۆ ئابووری بازاڕو بەشوێن ئەوەشدا گواستنەوە روویدا لە گەندەڵی سەرپێییەوە بۆ گەندەڵی ڕێکخراو.

لە قۆناغی دوای شەری ساردیشدا گرنگیدانی پسپۆڕان بە کۆڵینەوە لە ڕەوش و ماف و هەڵسوکەوتی فەرمانبەران زیادیکرد، چونکە تواناو بەکاری دامەزراوە حکومیەکان پەیوەستە بەتواناو بەکاری و پاکی ئەوانەی بەرپرسن لێی، ئەوانەی کە هەڵسوکەوتی نائەخلاقیان تێدا زاڵبوو وەك بەرتیل و خزمایەتی و عەیب شاردنەوە و خراپ بەکارهێنانی دەسەڵات وەکو یەك لە شێوازەکانی گەندەڵی رامیاری و کارگێڕی، کە تەگەرەیە لە ڕێی گەشەپێدانی سەربەخۆو گشتگیردا.

گەندەڵی حکومی وەکو دیاردەیەکی گشتی لێهاتووە کە رای گشتی هەراسان کردووە بەتایبەت لەو وڵاتە گەشەسەندووانەی خەریکی وەرگرتنی شێوازی کارگێڕی تازەن، کە بتوانێ ڕادە دابنێ بۆ لادان و هەڵسوکەوتە نائەخلاقییەکانی هەندێ لە بەرپرسان، بەپێشخستنی یاساو پێڕۆ کارپێڕاوەکان و توندی لە جێبەجێکردنیاندا لەپێناوی ئابلۆقەدانی دیاردەی گەندەڵی باوسەندوو لە ئیدارە گشتییەکانی دەوڵەتدا.

گەندەڵیش وەکو دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی فرەلایەن وا پێویست دەکا ئیدارە گشتییەکانی دەوڵەت لە هەموو ئاستە بەرزو نزمەکانیدا لە بەردەم لێپرسینەوەیەکی بەردەوامدابن. بەدرێژایی مێژووش داناکان هەمیشە ئامۆژگاری هەبوونی سیفاتی ئەخلاقیان کردووە لەو کەسانەی وەزیفەی گشتیان بەدەستە، ئەو وەزیفانەش وەکو پیشەیەك بوو بۆ ئەندامانی هەندێ خێزان و توێژی کۆمەڵایەتی،



کوڕان لە باوکانیان وەردەگرت ئەمانیش کوڕەکانیان فێری پیشەی ئیدارەو نهێنییەکانی و شێوازی هەڵسوڕانی دەکرد.

ئەوجار وەزیفەی گشتی پێشکەوتوو لەتەکیدا ڕەوشتەکان و ئەخلاقەکانیشی بەپێی کات و شوێن پێشکەوت و مافەکان و ئەرکەکانی فەرمانبەر گەڵاڵەبوو ئەرکەکانیش لە هەندێ رەوشتی تایبەتی و گشتیدا دەرەکەوێ وەکو[٢٢]:

- هەڵسوکەوت بەگوێرەی بەرژەوەندی گشتی و ئاگاداربوون لێی.
- وریابوونێکی زۆر لە جێبەجێکردنی یاساکان و پێڕۆ کارپێڕاوەکاندا.
- ملکەچبوونی فەرمانبەر بۆ سەرووی خۆی لەسەر بنەمای ڕێزگرتنی یەکتر.
- تەحەمولکردن و سەرخستنی ئەرکی بەرپرسێتی.
- وەجێگەیاندنی کاری وەزیفی بەدڵسۆزی و ئەمانەت و بینراوەییەوە.
- پاراستنی هەیبەت و ناوبانگی وەزیفەی گشتی
- پابەندبوون بە کاتەکانی ئیشیی رەسمیەوە.
- پاراستنی دارایی گشتی و هەڵسوکەوتی باش لەتەك هاوڵاتیاندا.

**ڕەوشتە تایبەتیەکانیش ئەمانەن :**

- نەدرکانی نهێنییەکانی ئەو ئیدارەی فەرمانبەر ئیشی تێدا دەکات.
- وەرنەگرتنی دیاری و بەخشین و یارمەتی.
- کۆنەکردنەوەی یاسایی لە نێوان وەزیفەی گشتی و کاری قەدەغەدا.
- پۆزلێنەدان بەسەر داواکاری خزمەتدا.

فەرمانبەری گشتی بەرانبەر ئەم ئەرکە گشتیانە هەندێ مافی هەیە وەکو:-
- دابینکردنی موچەی مانگانە بۆ فەرمانبەرە حکومیەکان.
- نیشانکردنی پاداشت و هاندەر بۆ ئەوانەی کار بۆ دەوڵەت دەکەن.

- بەرزە موچەو بەرزکردنەوە لە پاچینەی وەزیفیدا.
- پێدانی جۆرەکانی ئیجازەو کارو ئیسراحەت.
- موچەی خانەنشینی بەشێوەیەك ئاستی ژیانی شیاوی بۆ دابین بکات.
- هەڵسوڕانی ئەو مافە مەدەنی و ئازادیە گشتیانەی یاسا ڕێی پێداون.

لەسەر ڕۆشنایی ئەرکەکان و مافەکان دەتوانرێت فەرمانبەری حکومەت واپێناسە بکرێت «هەر کەسێ لە دامەزراوەیەکی دەوڵەتدا بەشێوەیەکی بەردەوام و هەمیشەیی ئیش بکات و پابەندبێ بەیاساکان و بەندە ڕێکخەرەکانی ئیشەکەی بەئامانجی وەدیهێنانی ئامانجەکانی دامەزراوەکەو ڕازیکردنی بەرژەوەندی گشتی».

## بنەما ئەخلاقییەکان

واباوە کە بنەمای ئەخلاقی قەبوڵکراوبێ لە ئەقڵی مرۆییەوە ئامانجەکەشی هێنانی سوودی گشتی و دوورخستنەوەی زیان بێت و هەر ڕەوشتێ مرۆییش بەگوێرەی بنەمای ئەخلاقی نەبێ، ئەوە ڕەوشتێ لادەرەو دەچێتە خانەی گەندەڵیەوە، هەر هەڵسوکەوتێکیش بەپێی بنەمای ئەخلاقی بێ، ئەوە ڕەوشتی ڕێك و ئەخلاقیەو ڕێ لە کەوتنە بەر چنگی گەندەڵی دەگرێ، واتە بۆ ئەوەی رەوشتی وەزیفی ئاسایی بێ پێویستە پشت بەبنەمای ئەخلاقی ببەستێ پێچەوانەکەش راستە[٢٣].

گومانیشی تێدا نییە کە ڕەوشتی نائەخلاقی لە ئیدارە ناحکومییەکاندا مەرج نییە لە بەکارهێنانی وەزیفەی گشتی بۆ دەسکەوتی تایبەتییەوە پەیدابێ، لە ئاماژەکانی ڕەوشتی لادەریش: ناسیاری، پێشێلکردنی دەسپێکی هاوهەلی، بێباکی لە خزمەتی گشتی بۆ هاوڵاتیان، لە سێبەری ئەم ئاماژانەشدا پەیوەندی هاوڵاتی بەئیدارەی گشتییەوە نزیك دەبێتەوە لە پەیوەندی شوێنکەوتوو بەشوانەوە،



هاوڵاتیش هەست بەستەم و لەبیرکراوی دەکات و باوەڕی بەدەزگای حکومی نامێنێ.[٢٤]

ئەوەش سەرنج رادەکێشێ ئەوەیە سەرەڕای روونی یاساکان و بەندە ڕێکخەرەکانی کاری ئیدارە گشتییەکان و سەرەڕای ئەو هەوڵدانە چاککارییە ئیداریانەی هەندێ وڵاتی گەشەسەندوو کردوویەتی، هێشتا بەرژەوەندی هاوڵاتیان بەپلەی جیاواز تووشی ونبوون و دزین و تاڵان دەبێ، ئەوەش باوەڕیان لەدەسدەدات بەپێڕۆی رامیاری و ئەمیش لەتەك ڕۆژگاردا ئارامێکەی تووشی خاوبوونەوەو ڕوخان دەبێت.

## نموونەکانی ئیدارەی گشتی

- نموونەی چەقبەستوو لەسەر پێڕۆی رامیاری، کە لە ئەخلاقەکانی زۆرینە دەدوێت لە ڕوانگەی ئەو بەهاو بروایانەی لە کۆمەڵگەی رامیارییەوە هەڵقوڵاون، ئەم نموونەش لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بلاوە.
- نموونەی دامەزراو لەسەر زانیارییەکانی دەوڵەت. ئەم نموونە جیاکاری دەکات لە نێوان ئەخلاقەکانی ئیدارەی وەرگیراو لە بەها کۆمەڵایەتیو حەزەکانی توێژە کۆمەڵایەتییەکان و لە نێوان ئەخلاقەکانی ئیدارەی گشتی وەرگیراو لە بەهاکانی دەوڵەت و پێداویستییەکانی، کە ئەمیش سەرچاوەی سەرەکی ئەخلاقەکانی ئیدارەی گشتییە.
- نموونەی رۆحی یان ئاینی. ئەم نموونە لە ڕوانگەیەکی ئایینی پەتیوە باس لە ئەخلاقەکانی ئیدارەی گشتی ئەکا، ئەو بەهاو ڕەوشت و هەڵسوکەوتانەی لە ئایینە ئاسمانییەکاندا هەن دەکرێ بکرێنە پێوەرێك بۆ ڕەوشتی تاکی.

بەچاوپۆشین لە ڕاستی و باوەڕپێکراوی ئەم نموونانە وەکو سەرچاوەیەك بۆ پێوانی ئەخلاقە گشتییەکانی ئەوانەی لە دەزگاکانی دەوڵەتدا ئیش دەکەن ئەزموونی چەندین دەوڵەت کێشەی ئەخلاقی دەرخستووە لە ئاستی ئیدارەو دامەزراوە حکومیەکاندا کاتێ فەرمانبەرە حکومیەکان ئەو باوەڕ و دەسەڵاتەی پێیان دراوە لەژێر فشاری وەلای خێزانی و ئێتنی و ئاینزایی و تایفەیی بەکاردەهێنن بۆ تێکدانی پیرۆزی گشتی و تێپەڕدانی بۆ وەدەسهێنانی دەسکەوتی تایبەتی لەسەر حسابی بەرژەوەندی گشتی، ئەوجار کۆمەڵگە پڕ دەبێ لە حاڵەتی هەراو پشتگوێخستن و بەرەڵایی و بێباکی و شێوەی گەندەڵی ئیداری وەردگرێ.

دەشتوانرێت ڕەوشتە نائەخلاقییەکانی هێندێ لە فەرمانبەرانی ئیدارە گشتییەکان بگەڕێنرێتەوە بۆ ئەم هۆیانە:

**یەکەم: هۆ ئابوورییەکان.** فرە هۆی لێدەبێتەوە کە پاڵ بەفەرمانبەرەوە دەنێن بۆ کاری نائەخلاقی وەکو:

- پێداویستی و هەژاری وەکو هۆکارێکی هاندەر بۆ وەرگرتنی بەرتیل.
- گەورەبوونی تەنگانەی ئابووری دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی دەسهاتی تاکی وا لە هێندێ کەس دەکا بەشوێن سەرچاوەگەلێکی داهاتدا بگەڕێ کە یاسا ڕێی پێ نادات.
- بەرزبوونەوەو بەردەوام بوونی تێکڕاکانی بێکاری.

دووەم: **هۆ رامیارییەکان**. ئەم هۆکارانەی تێدایە:

- نەبوونی پێشڕەوی ڕامیاری کە نموونەی خۆبەخت کردن و قوربانی دان بێ.
- باوسەندنی دیاردەی بیرۆکراتی حکومی.



- زیادەڕەوی لە ناوەندێتی ئیدارەی حکومیدا.
- لاوازی ئیشی هەرسێ دەسەڵاتەکە (جێبەجێکردن و یاسادانان و دادوەری)

**سێیەم: هۆ سۆسیۆکولتوورییەکان :**

- وەلائە خێزانییەکان.
- وەلائە ئێتنی و خێڵەکییەکان.
- مەیلە خوێنی و ڕەگەزییەکان.

لە نائامادەیی هۆشیارکردنێکی ڕامیاری کە وەلا بۆ نیشتمان و نەتەوە بەرزکاتەوە لە شوێنی خێزان و هۆز ...هتد، لە ئەنجامی لاوازی خولەکانی ڕاهێنانی پیشەیی و ئەخلاقی و دواکەوتوویی پلانەکانی ئیدارەو پەند وەرنەگرتن لێیان، ئەوە بەپلەی جیاواز هەر دەبێتە هۆی باوسەندنی کاری نائەخلاقی لە کۆتاییدا دەڕژێتە خانەی گەندەڵیەوە.

## ڕەوشتەکانی هەڵسوڕانی وەزیفەی گشتی

سێ تیۆر گرنگیان بەم ڕەوشتانە داوە:

**تیۆری سوودی:** لە دیارترین دامەزرێنەرانی «جێرمی بێنتام» ١٧٩٨، «جۆن ستیوارت میل» ١٨٦١، بەپێی ئەم تیۆرە ڕەوشتی ئەخلاقی بەوەدیهێنانی سوودی تایبەتی دیاری دەکرێت و کۆی سوودە تایبەتییەکان دەکاتە سوودی گشتی.

**تیۆری مافەکان:** «جۆن لوك» ١٦٩٠ و «کانت» ١٧٩٨ بەشداربوون لە پێشخستنی ئەم تیۆرەدا، بەقسەی ئەمان فەرمانبەری گشتی پابەندە بە وەجێگەیاندنی خزمەتی گشتی بەبێ مەرج، لە بەرامبەریشدا مەرجی گشتییان داناوە بۆ ئەو کەسەی دەیەوێ سوود لە خزمەتی گشتی وەربگرێ بەبێ جیاوازی.

**تیۆری دادوەری:** «ئەرستۆ» دایمەزراند و جۆن ڕاولسی ئەمریکی ١٩٧١ پەرەی پێداوە، داوای ڕەچاوکردنی دادوەری دەکات لە دابەش کردنی ئەو خزمەتە گشتیانەی فەرمانبەری گشتی پێشکەشی هاوڵاتیانی دەکات و ئەو خزمەتە گشتیانەش بە هەمان مەرج دەبێ پێشکەش بکرێن بەبێ جیاوازیەك کە بیانوی نەبێت لە نێوان سوود لێوەرگرانیدا.(٢٥)

بەمشێوە تیۆری دادوەری بنچینەی تیۆری بۆ ڕاست کردنەوەی ڕەوشتەکانی هەڵسوڕانی وەزیفەی گشتی دانا، وەلێ لەڕووی کردارەکیەوە وەدیهێنانی زەحمەتە، بۆیە هەندێ شارەزایانی ئیدارە پەنایان بردە بەر لێکۆڵینەوەی ژینگەی کارگێری و ئەو پەستانانەی کە تێیدایەو لەسەر ڕۆشنایی ئەوەش هەندێ ئامۆژگاریان پێشکەش کرد، کە دەتوانن ئاستی ئەو ڕەوشتە گشتیانە بەرزکەنەوە، کەچی هەندێ لە شارەزایانی ئیدارە لەوەولاتر چون و داوایان کرد کە بەڕێوبەرانی ئێستاو داهاتوو فێری ئەخلاقەکانی ئیدارەی گشتی بکرێن.



ئەوجار «کیرنفان»ی ئەمریکی لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانی دانا گرنگیدانەکانی گەلی ئەمریکی بەئاریشە ئەخلاقییەکانی تێدا نیشانکرد، کە پەیوەستن بەکاری حکومی و ئەو ئاریشانەی تێدایە کە پەیوەندن بەدژەوەستانی بەرژەوەندییەکان، شاردنەوەی زانیاری و پەردەپۆشکردنی و حەلاڵ کردنی چالاکی ڕامیاری بۆ فەرمانبەرە حکومیەکان.

هەروەها لێکۆڵەر گرنگیدا بەناوەڕۆکە ئەخلاقییەکانی پەیوەندی نێوان بیرۆکراتییەکان و رامیارییەکان و هەندێ میکانیزمی پێویستی دیاریکرد بۆ چارەکردنی سەرپێچیە ئەخلاقییەکان. «غۆشە»ش لە ساڵی ١٩٨١ بەدرێژتر لەو سەرپێچیانە دوا لە لێکۆڵینەوەکەیدا لەبارەی «پێکهێنەرەکانی ڕەوشتی ئەخلاقی»، تێیدا پێشنیازی پاڵپشتی کردنی بنەما ئەخلاقییەکانی کرد لە ئیدارەی گشتیدا وەکو وەسف کردن و پۆلێن کردنی وەزیفەی گشتی و هەڵسەنگاندنی کاری وەزیفی لە ئیدارەو پەیوەندیە گشتییەکاندا.

ڕەوشتە گشتییەکانی کاری وەزیفی و هەڵسوڕانە ئەخلاقییەکەی بەری پێشکەوتنی ئابووری ـ کۆمەڵایەتی درێژەو، گونجاندنە لەتەك ژینگەی چواردەوردا کە پێویستییەکانی بەدەنگەوەچوونی پێداویستیە بنچینەییەکانی خەڵك دەسەپێنی. زۆربەی هەڵسوکەوتە ڕەوشتیە گشتییەکانی ئیدارەش لە ڕێسای بەهای کۆمەڵگەیی وەرگیراوە کە بەدرێژایی زەمانە دانراوە وەکو:

بەهاکانی مانەوە، شەرەف، ئازادی، مەیلەکان، بڕوا ئاینییەکان و ئینتیما بڕواییەکان، سەرباری کۆی پەندو دەرس و ئەنجامە دەرهێنراوەکان لە هەڵسوڕانی وەزیفەی گشتی کە دوو ڕۆڵی بۆ فەرمانبەری حکومی دەرخستووە، یەکەمیان باشە کاتێك سیاسەتی گشتی تەبایە لەتەك ڕێسای بەهاکان و ئەو سەرەتایانەی بڕوای پێیەتی، دووەمیشیان خراپە کاتێ سیاسەتی گشتی بەرانبەری ڕێسا بەهاییەکان و سەرەتاکان دەوەستێ.

## تایبەتییەکانی گەندەڵی کارگێڕی

گەندەڵی وەکو دەربڕینێك لە پێشێلکردنی ئەرکە وەزیفییەکان و، هەڵسوڕانی چەوت کە سوودی تایبەتی پێش سوودی گشتی دەخات ئەم تایبەتیانەی هەیە :(٢٦)

١ـ بەشداربوونی پتر لەیەك لایەن لە گەندەڵکاریدا.

٢ـ ئەنجامدانی گەندەڵکاری زۆر بەنهێنی، لە تاریکە شەودا بەشێوازی فێڵ و خەڵەتاندن.

٣ـ گەندەڵی بەرجەستەی بەرژەوەندی و سوودی هاوبەشی گەندەڵکارانە.

گەندەڵی ڕێکەوتنێکە لە نێوان ویستی بڕیار بەدەست لەتەك ئەوانەی پێویستیان بەبڕیارێکی دیاریکراو هەیە کە خزمەتی بەرژەوەندیە تایبەتییەکان دەکات و بەس.

بەڕای «ئالاتاس» هەر کاری ئەو تایبەتیانەی بەسەردا بسەپێ ئەوە دیمەنێکە لە دیمەنەکانی گەندەڵی.(٢٧)

بەم شێوە دیاردەی گەندەڵی لە پشتی وتارێکی ئایدۆلۆجی ئاشکراوە ون دەبێ کە بەئاشکرا بەرگریە لە بەرژەوەندی گشتی و سوربوونە لەسەر جێبەجێکردنی یاسا، کەچی ڕاستیە شاراوەکەی گەورەکردنی دەستکەوتی تایبەتییە لەسەر حسابی بەرژەوەندی گشتی بە پێشێلکردنی یاساو پیرۆ کارپێکراوەکان و شکاندنی ئەرك و بەرپرسێتی وەزیفی. دیاردەی گەندەڵیی ئیدارە گشتییەکان دیاردەیەکی کۆنی نوێیە لە وڵاتە دەوڵەمەندو هەژارەکاندا، بەهێزو بێهێزەکاندا، پێشکەوتوو پاشکەوتووەکاندا، بلاوە تا ئەو ڕادەی کتێبخانە گشتی و تایبەتییەکان پڕبووە لە فەرهەنگ و فایلی گەندەڵی، ڕەنگیشە هەندێ کەس بیر لە دانانی فەرهەنگی بۆ بکاتەوە، لەسەر ئاستی دەوڵەتیشدا ڕێکخراوێکی حکومی دامەزراوە ئەویش «بینراوەیی دەوڵەتی»یە، حاڵەتی گەندەڵی نیشان دەکا لەسەر ئاستی گۆی زەوی



ئەوەشیان دۆزیەوە کە سەرچاوەی زۆربەی بەرتیلەکانی جیهانیی سێیەم جیهانی یەکەمە. لە فەرەنساشدا بیریاری فەرەنسی ناسراو جێنز ساڵی ١٩٩١ کتێبێکی لەسەر گەندەڵی دانا، لە فەنزەویلاش ساڵی ١٩٨٩ دوو بەرگ لەسەر گەندەڵی دەرچو بەناوی «فەرهەنگی گەندەڵی لە فەنزەویلا».

کەوایە گەندەڵی ئیداری بەدرێژایی شوێن و زەمانە هەبووە چ لە کەرتی تایبەتی و چ لە کەرتی گشتی، بلاوبوونەوەشی دەگەڕێتەوە بۆ کۆمەڵێ هۆ ئەمانەی باسدەکەین:

ـ بەرپرسە حکومیەکان متمانەو دەسەڵاتی فراوانیان هەیە لەتەك فشۆڵی لێپرسینەوەدا، بۆیە بە بەرتیل و دیاری و بەخشین لە خشتەدەبرێن لەلایەن ئەو کەسانەی لە هەوڵی وەدیهێنانی دەسکەوتی تایبەتی نارەوادان.

ـ زۆری بەربەستی حکومی کە ڕێ لە گرتنەبەری ڕێگەی ڕاست دەگرێ لە هاوڵاتیان وەکو کەلەبچەکانی بازرگانی دەرەکی پەیواندار بە بڕەکانی هاوردەو هەناردەوە، دابڕینە باجییەکان، زۆری نرخەکانی پارە گۆڕینەوەو بنەماکانی قەرز پێدان...هتد.

ـ ئەو قازانجە خەیاڵیانەی لە وەبەرهێنانی دەرامەتە سروشتیە دەگمەنەکانەوە دێنەدی بەتایبەت نەوت، هانی کۆمپانیا بیانییەکان دەدات بۆ بەرتیلدان بەهەندێ بەرپرسانی ئەو وڵاتانە بۆ وەدەسهێنانی ماف و جیاوکی بەکارهێنانی ئەو دەرامەتانە.

ـ هەژاری و نزمی دەسهاتی تاکی و نەبوونی دابینکاری لەشساقی، هەمووی هانی گەندەڵکاری دەدات بەتایبەت لە وڵاتە گەشەسەندووە هەژارەکاندا.

ـ شلوشاوی و فشوڵی یاسای سزاکان لە هەندێ دەوڵەتدا، سەرباری گەندەڵی دەزگای داد، هەمووی هانی گەندەڵکاری رامیاری و ئیداری دەدات، چونکە

ئەگەرەکانی هەلاَتن لە سزا دەوەستێتە سەر تیژی یان ئاسانکاری یاسا، دیارە بنەمایەك هەیەو وای دادەنێ کە تێچوی سەرپێچی یەکسانە بەئەگەری گرتنی تاوانکارو سزادانی جاران ئاستی سزاکە.[٢٨]

- لاوازی رەوشتە وەزیفییەکان لە سێبەری نائامادەیی لێپرسینەوەدا دەبێتە هۆی گەندەڵی.

- عورف و خووە باوەکانی هەندێ ولاَتی گەشەسەندوو تارادەیەك پاکانە بۆ خزمایەتی و ناسیاری دەکا، ئەمەش یەکێکە لە دیمەنەکانی گەندەڵی.

کەواتە ناتوانین تەنها لە سوچی ئابووریەوە گەندەڵی شیبکەینەوە، چونکە گەندەڵی ئەو سوچە بەجێدێڵێت و بەرەو لایەنی رامیاری دەکشێ کە ریشەی گەندەڵی تێدا نیشتووەو هەروەها گەندەڵی گەورەترو ترسناکترە لە ناوەندەکانی ئەو بەرپرسانەی ئیمزاکردنی گرێبەندە حکومیەکانیان بەدەستە، کە پەیوەندداره بەهەناردەی شمەك و خزمەتەکان و بڕیاری جیاوك پێدانیشیان بەدەستە بەرێگەی پێچاو پێچ و نارەوا.



## نیشانەکانی گەندەڵی

شێوەکانی گەندەڵی وەك یەك نین لەلایەنی ترسناکی و شوێنەوارەکانی لەسەر گەشەپێدانی رامیاری و ئابووری، ئەگەرچی زەحمەتە دیاری بکرێ کامیان خراپترە لەرووی کەمکردنەوە لە دادوەری کۆمەلاَیەتی و لە سەرەتای هاوهەلی و لە رەوایەتی دەولەت.[٢٩] هەروەها کەمکردنەوە لە مافەکانی مولکایەتی و کاریگەری لە تێکراکانی گەشەی ئابووری. سەرباری پیسکردنی ژینگە بەتایبەت بەپاشەرۆی ناوکی.

نیشانەو پێوەرەکانی گەندەڵی وەکو سەرەتا نیشانەگەلێکی گشتین جیاوازی ناکەن لە نێوان ئاستە بەرزەکانی گەندەڵی کە گەورەبەرپرسان پێی هەڵدەستن و لە نێوان ئاستە بچووکەکانی، هەروەهاش لە نێوان گەندەڵی سەرپایی و گەندەڵی رێکخراو، چونکە گشت دیمەنەکانی گەندەڵی چەند ئاستەکان و شێوەی رێکخستنەکانی جیاوازبوو یارمەتی یەکتر دەدەن و پێکەوە دەبنە هۆی دابەزینی ئاستەکانی گەشەپێدان و پاشقولدانی وەبەرهێنان و لاوازکردنی ژێرخان و دابەزینی داهاتەکانی دەولەت لە باج و رەسم و تێچوی خەرجییە ئیدارییەکانیش پتر دەکەن، سەرباری رۆڵی گەندەڵی لە لاوازکردنی رەوایەتی پێرۆی رامیاری و نائارامبوونی، بۆ زانینیش توێژە بۆگەنەکان لە هەوڵی پاراستنی پێرۆی رامیاری بۆگەندان بۆ پاراستنی دەسکەوتەکانی خۆیان.

سەرەرای ئەو زیانانەی گەندەڵی بەهەموو شێوەکانیەوە لە کۆمەڵگەی دەدات، خەڵك هەیە باس لە دوورایی وەزیفی گەندەڵی و رۆڵە باشەکەی دەکەن لە باشکردنی توانای جێبەجێکردن لەرووی: ئاسانکردنی کاروباری هاولاَتیان و باشکردنی هەڵسوکەوتی فەرمانبەرە بیرۆکراتییەکان بۆ هاولاَتیان. «ئوستەر فیلد» وای دەبینی کە بازاری ئازاد هۆکاری بنچینەییە بۆ گەشەپێدانی ئابووری، ئەو هەڵسوکەوتە بۆگەنانەی کە ئابووری دەجولێنن بەرەو میکانیزمەکانی بازار هەڵسوکەوتێلێکی بەسوودن، پێچەوانەی ئەو هەڵسوکەوتانەی کە بازاری ئازاد ناجولێنن کە زیانبەخش و تەگەرەن بۆ ئابووری.

ئەم جۆرەش لە گەندەڵی کە بەگەندەڵی فراوان ناوی دەبا لەرووی ئەخلاقیەوە بەرگری لێدەکرێ، چونکە ئامانجەکەی بەرگری کردنە لە شتومەك و مافی تاك لە هەڵسورانی ئیشەکانی خۆی بەویستی خۆی، بەواتایەکی دیکە گەندەڵی لێرەدا نیشانەیە بۆ کەلەبچەکانی سەر ئازادی و هەرکاتێ ئەو کەلەبچانە لاچوون گەندەڵیش نامێنێ.

بە چاوپۆشین لە ڕاستی ئەو بۆچوونەی ئوستەر فیلد هەتا ئەگەر وەکو گریمانەش شتی واهەبوو ئەوە هەر زوو دەبێتە شەوەیەکی ترسناك و هەڕەشە لە پاچینەی کۆمەڵایەتی دەکات، چونکە گەندەڵی وەکو ئاگر وایە تەڕو وشك پێکەوە دەسوتێنێت و ئەوەندەت زانی بەتایبەت کە دەبێتە دیاردە لەژێر کۆنترۆڵ دەرەچێت و تێچوی بەگژاچوونی گران دەکەوێ لە سێبەری لاوازی کاری دەزگا ئیداریە حکومیەکاندا.

لەتەك ئەوەشدا هەستێکی وا هەیە کە گەندەڵی لە ئاستە بەرزەکانی ترسناکترە تاکو ئاستە نزمەکانی، ئەگەریش گەندەڵی لەسەر ئاستی ڕامیاری بەردەوام بوو ئەوە ئابلۆقەدانی لەسەر ئاستی بیرۆکراتی زەحمەتە. ئەمەو بەگژاچوونی گەندەڵی و نەهێشتنی شوێنەوارە خراپەکانی دوو کۆمەڵە کارهەڵسوڕانی گەرەکە

یەکەم : ئەو کۆمەڵە کارهەڵسوڕانانە دەگرێتەخۆ کە ئامانجی بەگژاچوونی گەندەڵی ئیداریە بە :

- ڕکدان لە ئەخلاقەکانی وەزیفەی گشتی.

- سوڕدانی وەزیفی بۆ بەرپرسە حکومیەکان، چونکە مانەوەی بەرپرسی ئیداری ماوەیەکی زۆر لە هەمان شوێندا وەکو گومرك و بەرژەوەندییە باجی و خانوبەرەیەکان... هتد دەبێتە هۆی دەرکەوتنی دیاردەی گەندەڵی.

- بەرزکردنەوەی ئاستی کرێکاران و فەرمانبەرە حکومییەکان تا ئاستی کەرتە ئابووریەکانی دی، ئەگەر ئاستی دەسهات وەکو خۆی مایەوە ئەوە ئیدارە گشتییەکان کادرە کارامەکانیان دەدۆڕێنن و فەرمانبەرە نەکاراکانی تێدا دەمێننەوە، بەو شێوەش حاڵەتی گەندەڵی کارگێڕی بەردەوام دەبێ.



- قورسکردنی سزا تەمێکاریێکان بۆ فەرمانبەرە حکومیەکان و توند سەپاندنی سزای تیژو تەریقکەرەوە بۆ ئەوانەی پێڕۆی گشتی پێشێل دەکەن.

- پڕکردنەوەی بۆشایی نێوان هەڵسوڕانە ئیدارییە ڕەسمی و هەڵسوڕانە نارەسمییەکاندا، ئەو بۆشایەش چەند فراوان بێ گەندەڵیش لەتەکیدا فراوان دەبێت و پێچەوانەش ڕاستە.

- لێکۆڵینەوە لە وردی بڕیارە ئیدارییەکان و پەرەپێدانی ڕێسای لێپرسینەوە بۆ باشکردنی خزمەتە حکومییەکان و لە سنووردانی گەندەڵکارییەکان.

- زۆرکردنی دەزگا چاودێرییە ناوخۆیەکان لەسەر ئاستی هەموو ئیدارە حکومییەکان، بەکاری ئەمەش لە چەندین دەوڵەتدا سەلمێنراوە بۆ بەگژاچوونی گەندەڵی، بەتایبەت ئەگەر دەسەڵاتێ فراوانی هەبوو لە لێپرسینەوەی خراپەکاران و ئەوانەی کارە وەزیفییەکانیان پشتگوێ خستووە.

بۆ ئەوەش هەڵسوڕانی ئیدارە گشتییەکان ئەو ئامانجانەی لەسەریان بنیاتنراوە وەدیبێنن، دەبێ لە چوارچێوەی پلانێکی درێژخایەنی گشتگیرو تەواوکاردا بێ بۆ لە سنووردانی گەندەڵی وەکو ئەزموونەکەی فلیپین لە بواری ئیدارەی باجەکاندا کاتێ دادوەرێکی پاکی بەناوی «بلانا» وە دانا بۆ چارەکردنی ئاریشەی گەندەڵی لە بواری باجەکاندا، ئەویش[٣٠] دەستی کرد بەکۆکردنەوەی زانیاری لەسەر گەندەڵی و پێڕۆیەکی تازەی داهێنا بۆ ڕاستکردنەوەی هەڵسوڕان و سەپاندنی سزاگەلێکی تیژو بەپەلە بۆ گەورەبەرپرسە تاوانکارەکان، بەوەندەش نەوەستا بەڵکو کۆمەڵێ هەڵسوڕانی کردارەکی کرد کە ئاستی وەجێگەیاندن لە بواری باجەکاندا بەرز دەکاتەوە وەکو:

- چەقبەستن لەسەر لایەنی پیشەیی لە سپاردنی وەزیفەی ئیداریدا.

- تۆمارکردنی ناوی ئەوانەی خۆیان لە باج دەدزنەوە یان گومانی ئەوەیان لێدەکرێ.
- گۆڕینی یاسای باجەکان.
- گۆڕینەوەی شوێنە ئیدارییەکان لەنێوان فەرمانبەرە لێزانەکاندا.
- دامەزراندنی ووردبین لە دەرەوەی دەزگای باج.
- توندکردنی پێرۆکانی چاودێری .

لە ڕاستیشدا پێرۆی باج لە فلیپیندا چاککراو پاککرایەوە لە دیمەنەکانی گەندەڵی، بەڵام هەر زوو دیسان گەڕایەوە لە دوای تەواوبوونی ئیشەکەی «بلانا» کە ڕەخنەی ئەوەی هاتە سەر کە کەسی ڕانەهێنا ئەو ئیشە نیشتمانییە زەحمەتە لەدوای خۆی تەواو بکات.

لەم بارەیشەوە بەسوودی دەزانین ئاماژەیەك بکەین بەئەزموونی سەنگافورە، کە گەندەڵی تێدا ببوو بە «شێوازێك بۆ ژیان» لە ساڵی ١٩٥٩، بۆ ئەوەش لە شێوەی گەندەڵی ڕزگاری بێ «یاسای بەگژاچوونی گەندەڵی» دەرکردو هەروەها «نووسینگەی لێکۆڵینەوە لە گەندەڵکاری» ئەمەش هاورێ بوو لەتەك زیادکردنی موچەی فەرمانبەرە حکومیەکان و باشکردنی ئاستی ئیشکردنیان لە خزمەتە گشتییەکاندا، لەڕاستیشدا سەنگافورە سەرکەوت لە بەگژاچوونی گەندەڵی و سەرەك وەزیرانەکەی «لی کوان یو» ئەو سەرکەوتنەی گەڕاندەوە بۆ[٣١]:

١- دەرکردنی یاسا تایبەتییەکەی شەڕکردنی گەندەڵی.

٢- هاوکاری جەماوەر بەخەبەردان لە حاڵەتی گەندەڵی.



٣- دامەزراندنی «نووسینگەی کۆڵینەوە لە گەندەڵکاری» کە لێکۆڵینەوەکانی بەتیژی و توندی و بەبێ ترس بەڕێوە دەچێت و لەلایەن سەرەك وەزیران و ڕای گشتیشەوە پشتیوانی دەکرێ.

گومانی تێدا نییە کە هەنگاوە کرداریەکانی سەنگافورە شایانی گرنگی دان و وتووێژە و دەکرێ بکرێتە نموونەیەك، ئەو دەوڵەتانەی بەتەمای ڕزگاربوونن لە دیاردەی گەندەڵی رامیاری و کارگێری، چاوی لێبکەن.

دووەم: کۆمەڵێ کاری ئیداریە، ئەو تەگبیرو سیاسەتە خۆپارێزانە دەگرێتەوە کە ڕێ لە کەوتنە ناو زەلکاوی گەندەڵی دەگرن لەوانەش:

١- گرنگی دان بەلایەنی وەزیفی ئیدارە گشتییەکانی دەوڵەت بەدیاریکردنی وەزیفە ئیدارییەکان و هاندەرو پاداشت و بەخشین و دووبارە پەیکەربەندکردنی خزمەتی مەدەنی، بەشێوەیەك بەدەنگ پێداویستیەکانی دەوڵەتەوە بچێ.

٢- ڕۆشنبیرکردن و ئاگادارکردنی جەماوەر لە یاساکان و پێرۆ کارپێکراوەکان تا بتوانن مافەکان و ئەرکەکانی خۆیان بناسن.

٣- بواردان بەخەڵك بۆ خستنەڕووی سکاڵاکانیان لە خزمەتە گشتیە نەگونجاوەکان و هەڵسوکەوتی خراپی هەندێ فەرمانبەرانی دەوڵەت.

٤- فەرمانبەرانی دەوڵەت و گەورە بەرپرسان بخرێنە ژێر لێپرسینەوە لەبارەی سامانەکانیان پێش و پاش تەواوکردنی خزمەتە گشتێکەیان

٥- توندکردنی چاودێری لەسەر کەمکردنەوە گشتییەکان و مۆرکردنی گرێبەندو رێکەوتنی هاوکاری ئابووری و ئاڵشتی بازرگانی لەتەك دەوڵەتانی تردا.

٦- ڕێگرتن لە دەرچوونی سەرمایە بۆ دەرەوە بەپێشخستنی پێرۆ داراییە کارپێکراوەکان.

٧- دامەزراندنی دەستەیەکی چاودێری سەربەخۆ بۆ نیشانکردنی حاڵەتی گەندەڵی و پرسینەوە لە تاوانکارەکەی ئەمەش دەسگرتنی دەوڵەت بەسەر ئەو سامانانەی ناڕەوا وەدەسهێنراون دەگرێتەوە.

بەم شێوەیەش لەوەتەی کۆمەڵگەی مرۆیی هەیە گەندەڵیش هەبووەو دیاردەکەی بڵاو دەبێتەوە یان نامێنێ بەپێی سروشتی پێڕۆی رامیاری و ئابووری و باو بەگوێرەی گشتگیری و تیژی یاساکان. بەڵگەش بۆ ئەوەی گەندەڵی دیاردەیەکی دێرینی تازەبووەوەیە ئەوەیە لە ساڵی ١٠٦٩ ئیمپراتۆری چینی «شن تسونج»، «رامج ئان شییە»ی بانگ کرد بۆ دانانی بەرنامەیەکی چاکسازی ئیداری بۆ چاککردنی کێشە بەپەلەکان بەتایبەتی گەندەڵی، کە لەگشت ئاستەکانی خزمەتی مەدەنیدا بڵاو بووبووەوە. هەروەها کاتێ ئیبن خەلدون (١٣٣٢ـ١٤٠٦) دانرا بەدادوەر بۆ بەگژاچوونی گەندەڵی و سەرنەکەوت لە ئیشەکەیدا لەسەر کار لادرا، تەنیا لەبەر ئەوەی هەوڵیدا رووبەرووی گەندەڵی بێتەوە. لەم ڕۆژگارەشماندا گەندەڵی ئابووری چەندین دەوڵەتی گەشەسەندووی داچۆڕیوە و ئەوانیش لە هەوڵی نەهێشتنی شوێنەوارە ڕوخێنەرەکانیدان بەتایبەت لە وڵاتانی پڵنگانی ئاسیاو هەندێ وڵاتی ئەمریکای لاتین و وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست.

لەدوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئۆکتۆبەری سۆشیالیستی لە ساڵی ١٩١٧ کۆمەڵێ دەوڵەت کە سێیەکی دانیشتوانی جیهانی تێدا بوو، وازیان لە ئابووری بازاڕ هێناو ڕوویانکردە ئابووری پلانڕێژ لە ناوەندەوە، ئەو وڵاتانەش چەندە دەسکەوتی ئابووری و کۆمەڵایەتییان وەدەسهێنا هێندەش تووشی کێشەی ئابووری و کۆمەڵایەتی بوون لەئەنجامی گرنگیدان بەسەنعەتە قورسەکان و پشتگوێخستنی سەنعەتە سوکەکان، کە پێداویستی بەکاربەرەکی هاوڵاتیان پڕدەکاتەوە و کەمی ئەو پێداویستیانەش بوو بەهۆی دەرکەوتنی ئەوەی بە «ئابووری ماڵەکان» ناودەبرێ. سەرباری دابەزینی لێزانی وەجێگەیاندنی ئابووری و کارگێڕی لە ئەنجامی چەقبەستی موڵکایەتی بەدەستی دەوڵەت و پەراوێزخستنی هاندەرە تاکییەکان. بۆ باشکردنی ئەو بارەش هەر زوو هەندێ هەوڵدرا، بەڵام بەلانی کەم نەیتوانی ئەو بۆشاییە تەکنۆلۆجیەی نێوان دەوڵەتە سۆشیالیستەکان و دەوڵەتانی ڕۆژئاوای سەرمایەداریدا پڕ بکاتەوە.

ئەوجار چاککاری دۆڕاو «گورباچوف» لە ناوەڕاستی هەشتاکاندا هات و سیاسەتی «پیرسترۆیکا»ی جاڕداو لەژێر دروشمی بریقەداردا وەکو ئاشکرایی و بینراوەیی و لێپرسینەوە جێبەجێکرا، ئەنجامە کردارەکییەکەشی کۆتایی دەوڵەتە سۆشیالیستەکان بوو بەهەڵوەشانی یەکێتی سۆڤیەت بۆ چەند دەوڵەتێ سەربەخۆو خاوەن سەروەری، کە بەشوێن یەکدا لە سەرەتای نەوەدەکاندا وازیان لە پلانڕێژی ناوەندی هێناو ڕوویان لە ئابووری بازاڕ کرد. هەندێکیان پایان هەڵنا لە دووبارە پەیکەربەندی پێڕۆی ئابووری و وەرگرتنی شێوازی دیمۆکراتی بورجوازی و فرە حزبی وەکو وڵاتانی ئەورووپای ناوەڕاست و ڕۆژهەڵات، کەچی هەندێکی تریان وەکو چین و ڤێتنام هەندێ میکانیزمی ئابووری بازاڕی سۆشیالیستی پەیڕەو کرد بەبێ گواستنەوەی رامیاری و دوور لە زاڵبوونی حزبی شیوعی.

گەشەپێدانی بەردەوام لە قۆناغی گواستنەوە بۆ ئابووری بازاڕ، حکومەتی بەهێزی گەرەکە تابتوانێ بنەماکانی گەمەی دیمۆکراتی دیاری بکات و میکانیزمە



پێویستەکانی هەڵسوڕانی دروست بکات، ئەمەش بەسەروەری یاسا نەبێ نابێت و پراکتیزەکردنی یاساش کەشێکی دەوێ لە بینراوەیی و لێپرسینەوە بەشێوەیەکی دادوەرانە لەسەر هەمووان، دەوڵەتیش دەبێ توانایەکی بەرزی هەبێ بۆ هەڵساندنەوەی ژیانی ئابووری و چارەکردنی کێشە کۆمەڵایەتییەکان وەکو هەژاری. وەلێ قۆرخکردنی هۆیەکانی پابەندکردن لەلایەن دەوڵەتەوە دەسەڵاتی دەستێوەردانی پێدەدات لە ژیانی ئابووری دانیشتواندا، ئەم حاڵەش بوار بۆ گەورەو بچووکی بەرپرسە حکومییەکان دەکاتەوە بۆ وەدیهێنانی مەبەستە تەسکە تایبەتییەکانیان لە گەندەڵکاریدا، ئەمەش باوەڕپێکراوی دەوڵەت و حوکمی یاسا لاوازدەکات و هەندێ فەرمانبەری دەوڵەت لە سەرووی یاساوە دەبن، پاڵیش بە تاکەکانی کۆمەڵگەوە دەنێ هەمان شت بکەن.

لە ڕاستیشدا بەکارهێنانی وەزیفەی حکومی بۆ وەدەسهێنانی دەسکەوتی تایبەتی لە ڕێگەی «قاپییەکانی پشتەوە» و «بازاڕی ڕەش»دا باو بوو لە وڵاتە سۆشیالیستەکاندا لە قۆناغی گواستنەوەشدا بەرەو ئابووری بازاڕ بەردەوام بوو، بەڵام لێرەدا گەندەڵی بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا دەرکەوتوو شوێنەوارە خراپەکانی لەسەر پرۆسەی وەبەرهێنان و تێکڕاکانی گەشەی ئابووری، ڕەنگدەداتەوە.

## شێوازو هۆیەکانی گەندەڵی

چاکسازییە ئابووری و ئیدارییەکانی ئەو وڵاتانەی پێشتر سۆشیالیستی بوون بەتایبەت تایبەتکردنی کەرتی گشتی هاوکات بوو لەتەك حاڵەتی گەندەڵی رامیاری و کارگێڕی لەڕووی[٣٢]:

ـ داهاتەکانی دەوڵەت لە باج و ڕەسمی گومرگ دای لە کەمی، سەرباری لاوازی وەرگرتن و کۆکردنەوەی، لە ئەنجامی ئاڵۆزی پێڕۆی باج و ئەمەیش هانی خۆدزینەوە دەدات لە

باج، چونکه بەرزی تێکڕاکانی باج و فرەجۆرییەکەی و سزا توندو زیادەڕەوییەکان بواری بڵاوبوونەوەی گەندەڵی ڕەخساند لە ناوەندەکانی فەرمانبەرانی باجدا.

ـ داکشانی ئاستە ژیانییەکان لە ئەنجامی بێدادی لە بەشینەوەی دەسهات و ساماندا، کە بۆتە هۆی زیادکردنی تێکڕاکانی هەژاری و بڵاوبوونەوەی، ئەمەش ژینگەیەکی باشی ڕەخساندووە بۆ گەشەکردنی گەندەڵی و پەیمانبەستنی لەتەك تاوانی ڕێکخراودا هەروەکو لە رووسیای یەکگرتوو ڕوویدا، کە لە نێوان دوو ئەگەردا وەستاوە: یا دەبێتە دەوڵەتێکی تێکەڵە «تاقم» ڕێژەیەکی بەرز لە تاوانی ڕێکخراوی تێدایەو هەندێ پارەدار حوکمی دەکەن و گوێ بەیاسا باوەکان نادەن، لەم دەوڵەتەشدا گەندەڵی بڵاو دەبێتەوە لە سەرەوە بۆ خوارەوە، بەشێوەیەك پەیوەندی کەسێتی و ناسیاری شوێنی دامەزراوەو یاسا کارپێکراوەکان دەگرێتەوە. ئەگەری دووەمیش ئەوەیە ببێتە دەوڵەتێکی دیمۆکراتی لەسەر شێوازی ڕۆژئاوایی، پشت بە ئابووری بازاڕ ببەستێ کە بەکاربەری گەورەی بازاڕەو ئامانجی سیاسەتە ئابوورییەکان دابین کردنی خزمەتە بۆ هاوڵاتیان نەك بۆ فەرمانڕەواکان، هەروەها کار بنچینەی سەرکەوتنی مرۆڤە، سەرباری ڕێزگرتنی ئازادییە کەسییەکان، ئاستی گەندەڵیش لێرەدا لە سنوورە نزمەکانی دایەو بەهۆی بەکاری دامەزراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی، ناتوانێ ببێ بەدیاردە.

ـ لەدوای ڕوخانی بلۆکی سۆشیالیستی و گواستنەوەی بەرەو ئابووری بازاڕ، توێژە پێشتر بۆگەنەکە بەردەوام بوو لە گەندەڵکاریدا، لە سەردەمی نوێشدا تەنیا بەرگ و شێوەی خۆی گۆڕی و بەردەوام بوو لە گەندەڵکاریدا تا وڵاتی گۆڕی بۆ شێوەیەکی نوێ لە سەرمایەداری، «ڕێگرەکان» ئەوانە نە سۆشیالیست و نە دیمۆکراتی، نە پارێزگار و نە لیبرالن، ئەوانە گوێ بەئینتما نیشتمانییەکان نادەن و ختورەیان دەسکەوتنی پارەیە بەڕێگەی ڕەواو ناڕەوا. کردەوەکانی گروپی «ئەناتولی چوبایس» ئەمە دووپات دەکاتەوە کە سەرپەرەشتی پرۆسەی تایبەتکردنی دەکرد لە روسیاداو ٥٠٠ کارگەو کۆمەڵگەی سەنعەتکاری فرۆشت بەنرخێکی هەرزان، ئەویش حەوت ملیار دۆلار بوو لەکاتێکدا نرخە ڕاستەقینەکەی بەلای کەم ٢٠٠ ملیار دۆلار بوو. ئەمەش نموونەیەکی ئاشکرای



گەورەترین پرۆسەی فێلبازی و گەندەڵکارییە لە مێژووی ڕوسیادا. هەروەکو «جۆرج سورس»ی ئابووریناس وتی، دەرامەتەکانی دەوڵەت دزران و دوای ئەوەی دەوڵەت بوو بە سەرچاوەی ڕەوایەتی و لە ئەنجامی گەندەڵکاری ئاشکرادا لە ڕوسیا ئەویش دزرا، بانکی دەوڵەتیش لە لوتکەی پیرۆ بۆگەنەکاندا پۆلێنی کردووە لە جیهاندا، هەروەها راپرسییەك دەریخستووە کە بەرتیل باشترین ڕێگەیە بۆ سەرکەوتن و لە وەڵامی پرسیاری چ پیوەرێك باشە بۆ دەوڵەمەند بوون؟ دەرکەوت کە ٨٨٪ پەیوەندی کەسیان داناو ٨٦٪ گەندەڵیان هەڵبژاردو ٣٩٪ کارکردن. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە ئابووری روسی بەڕێی گەندەڵی و تاوان و زاڵبوونی کەمینەدا دەچێت و لە چەند ئاستێکدا گەندەڵکاری دەکەن :

**یەکەم:** گەندەڵی سەرۆکایەتی: ئەمە گرێبەستە بەسەری دەوڵەتەوە بەتایبەت لەو وڵاتانەی حوکمی تاکڕەوییان تێدا زاڵەو دەسەڵاتی سەرۆکایەتی فراوانی هەیەو ناوپۆشێك دەوری داوە لە سوودخوازان و هەلپەرستان کە بەرژەوەندیە تایبەتییەکانی خۆیان بەڕێگەی ناڕەوا وەدیدەهێنن و دیارترین نموونەش سەرۆکی پێشوی روسیاییە «یەڵسن»، کە کۆمەڵێ ڕاوێژکاری دز دەوری دابوو هەندێکیشیان کۆنە وەزیر بوون و پەرلەمان متمانەی لێسەندبوونەوە، ئەنجومەنی دۆماش داوای لەکارخستنی کرد لەدوای ئاراستەکردنی ئەم تۆمەتانە[٣٣]:

ـ هەڵوەشاندنی یەکێتی سۆڤیت.

ـ لەکارخستنی دەستوورو بە تانك بۆردومانکردنی پەرلەمان لەساڵی ١٩٩٣.

ـ هەڵگیرسانی شەڕی چیچان.

ـ لاوازکردن و کەمکردنەوەی توانا بەرگرییەکانی سوپا.

ـ داڕوخانی ئابووری و بەتاڵان بردنی سامانەکانی وڵات.

**دووەم:** گەندەڵی دامەزراوەیی: لە دامەزراوەکانی دەوڵەتدا بڵاودەبێتەوە کاتێ تووشی لاوازی دەبێت و بنەما ڕێکخەرەکانی کار لەدەست دەدات، لە سێبەریدا «دەوڵەتی چەتە»

دەرکەوێ، واتە دەزگای دەوڵەت دەبێتە تیشکۆی گەندەڵی، سامانەکانی وڵات و سەرڕێژە ئابوورییەکەی تووشی پرۆسەی تاڵانکردنی ڕێکخراو دەبن لەلایەن هەندێ سوودخوازەوە، دیمەنەکانی گەندەڵیش بەڕوونی دەردەکەوێ لەکاتی دانانی هەندێ وەزیر یان لەکارخستنی هەندێکی تردا یان لەکاتی ڕێکخستنی هەڵمەتی هەڵبژاردندا، لێرەشدا ئاماژە بە هەڵمەتی هەڵبژاردنەکەی یەلسن دەکرێ لەساڵی **١٩٩٦** کە یەك ملیار دۆلاری تێچو لەڕێی کۆکردنەوەی ملیۆنان دۆلار لە جولەکەو حەوت دەوڵەمەندەکەی ڕوسیا، دواتریش هەندێکیانی لە پایەی بەرزدا دامەزراند لە پاداشتی ئەو خزمەتانەی لەکاتی هەڵبژاردندا پێشکەشیان کرد.

**سێیەم:** گەندەڵی ئیداری بیرۆکراتی: لێرەدا بەرتیل کە زۆرترین شێوازەکانی گەندەڵی بچووکە، باو دەسێنێ لەژێر پەستانی خراپی باری ئابووری و ئاستی ژیانی، گەندەڵی ئیداری سنووردار لە ناوەندەکانی فەرمانبەرانی ئیدارە خۆجێییەکان و خزمەتە مەدەنییەکان و پۆلیسدا بڵاودەبێتەوە، کەچی گەندەڵی ئیداری بێسنوور گەورە بەرپرسانی دەوڵەت دەگرێتەوە کە بەنهێنی و بێدەنگی داپۆشراوە.



## گەندەڵی و تاوانی ڕێکخراو

تاوانی ڕێکخراو لە چەندین لەو دەوڵەتانەی بەکەشتی ئابووری بازاڕدا ڕۆیشتن بڵاوبووەتەوە، تا ئەو ڕادەی لە هەندێ دەوڵەتدا «مافیا» شوێنی پێشەوەی گرتوو زاڵبووە بەسەر بازاڕدا بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییانەی دامەزراوە حکومیەکان بەجێیان هێشت، گروپەکانی مافیاش پیاوانی کار دەپارێزن و ئاسانکاریان بۆ دەکەن لە بەستنی پرۆژەنامەدا بەرانبەر پارەیە زۆر، هەروەها ڕەواج دەدەن بەپارەی قەڵب و پاکردنەوەی پارەش، هەرکەسیش لە ملکەچیان دەرچێت تووشی توندوتیژی دەبێت تاڕادەی کوشتن.

ئەو دەوڵەتانەش وا لە هەوڵی نەهێشتنی مافیادان تووشی کێشەی زۆر دەبنەوە، هەندێکی پەیوەستە بەحکومەتەکانەوە کە حەز لە جێبەجێکردنی یاسا ناکەن، بەڵکو هەندێ گەورە بەرپرسانی هەندێ دەوڵەت پەیوەندییان بەگروپەکانی تاوانی ڕێکخراوەوە هەیە، دەسکەوتی گەورەشیان هەبووە لەو پەیوەندیەدا، بۆیە بەرژەوەندییان لە جێبەجێکردنی یاسا یان لە دانانی یاسای تازەدا نییە بۆ گۆڕانی ئەو بارودۆخەی کە هەیە. سەرباری بڵاوبوونەوەی بەرتیل لە ناوەندەکانی دەزگای پۆلیسدا، لەوەیشە هەندێ کەس تووش بوبێ لەتەك گروپەکانی تاوانی ڕێکخراودا کە زاڵن بەسەر پێرۆی دارایی و تۆڕی بانکیدا لە هەندێ دەوڵەتداو میکانیزمەکانیشی هەڵدەسوڕێنن بە وەکارهێنانی هۆکاری تەکنیکی پێشکەوتوو.

## تێچوی گەندەڵی

ئەگەر دیاردەی گەندەڵی لە کۆمەڵگەدا بڵاوبوەوەو حوکمی گرتەدەست، ئەوە شوێنەوارەکانی زۆر ڕوخێنەرە لە هەردوو لایەنی ئابووری و رامیاریدا، تێچوی نەهێشتنی ئەنجام و بەشوێندا هاتووەکانیشی گران دەکەوێ لەسەر کۆمەڵگە لەڕووی:

- نایەڵێ حکومەت بەرنامەکانی بخاتە گەڕو داهاتەکانی کۆبکاتەوەو ئەوەی پێی دەوترێ ئابووری سێبەر دەردەکەوێ دوور لە چاوی حکومەت.

- نایەڵێت دەرامەتەکان لە بوارە گرنگەکاندا بەکاربهێنرێن وەکو فێرکردن و لێکۆڵینەوەی زانستی.

- تێکڕاکانی گەشەی وەبەرهێنانە تایبەتی و بیانییەکان لاواز دەکات، بەتایبەت ئەگەر حکومەت بەئەنقەست هەندێ بۆشایی بەجێهێشت لە یاسای ڕێکخستنی وەبەرهێناندا بۆ ئەوەی گەورە بەرپرسان سوودی لێوەربگرن لە دەسهاتی نارەوادا.

- هانی بەرپرسان دەدات بۆ بە هەرزان فرۆشتن یان بە کرێدانی دامەزراوەکانی کەرتی گشتی.

بەوشێوە قۆناغی گواستنەوە لە ئابووری پلانرێژەوە بۆ ئابووری بازاڕ حاڵەتی گەندەڵی بەخۆیەوە دەبینێ و، ڕاپرسییەکی نزیکەی ٤٥٠ وەبەرهێنی بیانی دەریخستووە کە لەمەولا حەز لە وەبەرهێنان ناکەن لە وڵاتانی ئاسیادا بەهۆی بڵاوبوونەوەی بەرتیل تێیاندا. هەروەها «کۆمپانیای وەبەرهێنانی ترسناکیە رامیاری و ئابووریەکان» لەساڵی ١٩٩٩ دوپاتی کردەوە کە گەندەڵی تەنیا کێشەیەکی دوورەپەرێز نییە، بەڵکو بووە بەشتێکی واقعی و ناخۆش بۆ تاکەکان و کۆمپانیاکان لەو دەوڵەتانەی بەرتیلیان تێدا بڵاوە.[٣٤]

ئێستا دیارە کە گەندەڵی دیاردەیەکی دوورەپەرێز نییە لەو کەشە کۆمەڵگەییەی تێیدا گەشەدەکات، بەڵکو بەرو ئەنجامە بۆ نائامادەیی بینراوەیی دارایی و لاوازی هەستی بەرپرسی لە ئەنجامی قورسکردنی هەڵسوڕانەکانی لێپرسینەوەی تاوانکاران.

بینراوەیی داراییش دەتوانێ سلامەتی وەجێگەیاندنی دارایی دابین بکات لەبارەی متمانە بەخشین بەبودجەی گشتی دەوڵەت لەکاتی خۆیدا. ئەمەش ڕەنگ دانەوەی وردی کاری حکومەت و ڕێکیەتی، کەچی نەبوونی بینراوەیی دارایی دەبێتە هۆیی



بەفیرۆچونی دەرامەتەکان. سەرباری لەرینەوەی باوەڕی هاوڵاتیان بەدەوڵەتەکەیان، چونکە دەرامەتەکان بەفیرۆدەدات و دادوەر نییە لە بەشینەوەیدا ئەمەش تووشی نائارامی دەکا. لێپرسینەوەش وەکو ئامرازێ بۆ ئابڵوقەدانی گەندەڵی، کەلەبچەیەکە لەسەر هەڵسوکەوتی بەرپرسە حکومیەکان و پابەندیان دەکات بەچاودێری یاساو ڕێزگرتنی ماف و حەزەکانی هاوڵاتیان. بۆ بەکارخستنی سەرەتای لێپرسینەوەش دەبێ یاسای تیژو کردارەکی دابنرێ بۆ ڕێك گرتنی وەجێگەیاندنی دامەزراوەکانی دەوڵەت لەڕووی یاسادانانی باج و پاراستنی مافی مولکایەتی تاکی و کەمکردنەوەی ناوەندێتی دەسەڵات و گواستنەوەی هەندێکیان بۆ دەسەڵاتی ئیدارە خۆجێیەکان، سەرباری هەڵمەتی هۆشیاری گشتی کە سۆزو خۆنەویستی بۆ بەررژەوندی گشتی بوروژێنێ.

چاکسازییە ئابووری و کارگێڕییەکان چەند پتەوو مەبەستداربن، چارەنووسیان دۆڕانە ئەگەر هاوڕێ نەبن لەتەك چاکسازییەکی تەریب لە ئیدارە حکومیەکان و دامەزراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنیدا، بەشێوەیەك بەشداربێ لە هەڵوەشانی پەیوەندی نێوان پارەو دەسەڵات، واتە لەنێوان سامان و هێزدا، ئەو پەیوەندیەی کە ژینگەیەکی باشە بۆ گەشەکردن و بڵاوبونەوەی دیاردەی گەندەڵی، سەرباری پتەوکردنی دیمۆکراتی و توندکردنی لێپرسینەوە و چاککردنی دەسەڵاتی دادگەیی کە پێش هەموو شتێك پێویستە پاك بێ.

هەروەها ئەم چاکسازییانە پێویستە هاوڕێبن لەتەك جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان لەبەرئەوەی چەند مەودا فراوانتر بێت و هەنگاوەکان پتر بن لەنێوان ئەو لایەنانەی یاسا جێبەجێدەکەن، هەندەش هەڵی گەندەڵکاری کەم دەبێتەوە بۆیە جیاکردنەوەی هەرسێ دەسەڵاتەکە بەشێوەی ئاسۆیی و ستونی گرەنتییەکی ڕاستەقینەیە بۆ سەلامەتی پیادەکردنی پێرۆی گشتی.

بەوشێوەیە زۆربەی دەوڵەتانی سەر زەوی بەپلەی جیاواز کارتێکراوبوون بەو گۆڕانکاریە ئابووری و رامیارییە ڕامالێنەرانەی لە دوا دەیەی سەدەی بیستەمدا

روویدا. لەسەر ئاستی هەرێمی چەندین دەوڵەت سیاسەتی چاکسازی ئابووری و بەرنامەی جێگیرکردنی پەیکەریان پەیڕەو کرد بەئامانجی باڵبەستکردنی وەزیفەی دەوڵەت لە ژیانی ئابووریدا بەتایبەتکردنی دامەزراوەکانی کەرتی گشتی، ئەو گواستنەوە دراماتییەکیانەش هاوکات بوو لەتەك دەرکەوتنی هەندێ وێنەی گەندەڵی رامیاری و کارگێڕی تا دەگاتە دەرکەوتنی ئەوەی پێی دەوترێ تاوانی رێکخراو، کە پشت بەتەکنیکی تەکنۆلۆجیا دەبەستێ وەکو بەکارهێنانی کۆمپیوتەرو تۆڕی ئەنتەرنێت لە گەندەڵکاریدا، نوێترین وێنەکانیشی پرۆسەی پاککردنەوەی پارەیە.

بۆ بەرگرتن لە هەموو وێنەکانی گەندەڵی دەبێ ویستی ڕامیاری هەبێ بۆ ڕێگرتن لە دیمەنەکانی گەندەڵی، کە دەبێتە هۆی بەفیڕۆچوونی دەرامەتەکانی وڵات و لاوازکردنی گەشەپێدان، بەڵکو روخانی ئابووری وڵات لە دەوڵەتێکی وەکو نەیجیریا و ئەندەنووسیاو روسیا کە ڕێکخراوی بینراوەیی دەوڵەتی پێشبینی داڕوخانیان دەکات. ئەندەنوسیا وەکو نموونەیەك پارەی بانکەکانی دەوڵەتی تەرخانکرد بۆ دامەزراندنی پرۆژەگەلێك گەورە بەرپرسان بەشدارن تێیدا، حکومەتیش ئیجازەی بەبانکەکان دا پاشەکی قەرزەکان کەڵەکە بکەن لە نەوەدەکانداو بێدەنگیش بوو لە دانەوەیدا. فێڵیشی کرد لە خۆدزینەوە لە یاساکانی رێگرتن لە قەرزی بیانی، ئەمەش نرخی روپیەی دابەزاند، لەساڵی **١٩٩٧** ووردەوردە پێرۆی دارایی هەرەسی هێناو کەوتە سەر ساجی عەلی و دواتر بەرەڵاکردنی کرێکاران، لە ئەنجامی ئەوەشدا نیوەی دانیشتوانی ئەندەنوسیا دابەزینە خوار هێڵی هەژاری.

حاڵی ڕوسیاش لە ئەندەنووسیا باشتر نییە، لێرەدا دەسەڵات پەیمانی بەست لەتەك پیاوانی کاردا بۆ دابەشکردنی کێکی گەندەڵی، ئەمەش توانای ئابووری روسیای لاوازکرد سەرەڕای ئەو دەرامەتە سروشتی و مرۆییە زۆرەی کە هەیەتی، تێکڕاکانی گەشەکردن کشایەوە، ئەو دەرامەتانەش تووشی تاڵانکردن و دزین و بەکارهێنانی لەلایەن «پشیلە قەڵەوەکان» کە مافیای روسی پالپشتیان دەکات، بوونەوە.



لەبارەی شێوەکانی گەندەڵی لە دەوڵەتە لیبراڵ و دیمۆکراتییەکاندا ئەوە ئەوان ئەوەندە ویستی رامیاری و میکانیزمیان هەیە کە نەیەڵێ رووبەری گەندەڵی فراوان بێت و ببێتە دیاردە وەکو یابان و ئیتالیا و ئینگلتەراو شوێنی تریش، کە لە گەورە بەرپرسانیان دەپرسینەوە لەکاتی ئەنجامدانی هەر سەرپێچیەکی دارایی کە زیان بە ئابووری وڵات بگەیەنێت.

بەپێی ئەمەی رابورد، ئەو دەوڵەتانەی وازیان لە پلانڕێژی ناوەندی هێناو گواستیانەوە بۆ ئابووری بازاڕ دایان لە سێ تەگەرەی سەرەکی کە بۆنە هۆی بڵاوبوونەوەی دیاردەی گەندەڵی(٣٥):

١- لاوازی و ناپاکی دەسەڵاتی دادگەیی.

٢- بەیەکداچوونی سنووری موڵکایەتی تایبەتی و موڵکایەتی گشتی و دەوڵەمەندبوونی ناڕەوا بەهەلۆەشانی کەرتی گشتی و فرۆشتنی بۆ کەرتی تایبەتی.

٣- زۆری و بەیەکداچوون و پەلپەلبوونی یاساکان بوونە هۆی نەتوانینی دڵنیابوون لە سەلامەتی وەجێگەیاندنی حکومی. بۆ رووبەڕووبوونەوەی ئەوسێ تەگەرەش کە کەشی گەندەڵی ئامادەکرد واپێویستە دیمۆکراتی ڕاستەقینە بنیاتبنرێ کە مافەکان دابین بکات و ئەرکەکان بچەسپێنێ بە دروستکردنی دامەزراوەی رەسمی کە ملکەچی لێپرسینەوە بێ، هەروەها چاودێریەکی تیژ لەسەر تەرازووی پەیوەندی هەرسێ دەسەڵاتەکە.

بۆ ڕاستکردنەوەی ژیانی ئابووری و رامیاری، دەبێ کێشە ئابووریەکانی وەکو هەڵاوسان و بێکاری و قەرزاری لەسەر بنچینەی ئابووری ساق چارە بکرێت. هاوڕێ لەتەك باشکردنی موچەی فەرمانبەران، سەرباری گۆڕینکاری بونیادی لە رێسای کۆمەڵایەتیدا بەشێوەیەك بەهاکانی دیمۆکراتی بچەسپێت و یاسادانانە ناوخۆییەکان پێشبخات و ئاسان بکات و پێرۆی دادگەیی پاك و بەهێز بێنێتە دی، لەوەیشە رووبەڕووبوونەوەو نەهێشتنی گەندەڵی هەندێ کاتی بوێت.

له سەرەتای هەشتاکانی سەدەی بیستەمدا چین جاری بەرنامە تازەکەیدا له پەیڕەوکردنی میکانیزمەکانی ئابووری بازاڕیی سۆشیالیستی، بەئامانجی وەکارخستنی گەشەپێدانی ئابووری و کۆمەڵایەتی و بەهەڵوەشاندنی بۆماوەکانی پێڕۆی گشتگیرو دانانی سیاسەتی ئابووری کراوەتر لەسەر بنەمای فرەیی ئابووری، که تێکڕای گەشەکردنی پتری وەدیهێناو ڕەوایەتی و هێمنیشی دا بەسەر ڕژێمەکەیدا.

چاکسازییە ئابوورییەکان له چیندا بەگواستنەوە بەرەو ئابووری بازاڕ وەدیهاتن له بارودۆخێکدا که دەوڵەت زاڵ بوو بەسەر شوێنە بنچینەییەکانی ئابووری نیشتمانی، ئاسانیش نییە دەوڵەت واز له وەزیفەی و زاڵبوونی بەسەر گەشەپێدانی ئابووریدا بێنێ، ئەم دەسوەردانەش که هەر دەبێ هەبێ میکانیزمەکانی ئابووری بازاڕ ئیفلیج دەکات و دەیشێوێنێ، کەچی هەندێکی تر وای دەبینین که دەسوەردانی دەوڵەت له ژیانی ئابووریدا جوڵەی بازاڕ ڕێکدەخات و نایەڵێ تێکبچێ، بەم ڕێگەیەش چین چاکەکانی ئابووری پلانرێژو ئابووری بازاڕی تێکەڵکرد، بەڵام ئەم سیاسەتە لەقە لەدوای ١٥ ساڵ له پەیڕەوکردنی بەرنامەی چاکسازی ئابووری، چینی ڕزگار نەکرد لەو ئاریشانەی که پرۆسەی گواستنەوە بۆ ئابووری بازاڕ دەریهاوێشتووە، بەر له هەمووشیان ئاریشەی گەندەڵی رامیاری که لەشی چینی دادەرزێنێ و وایلێهاتووە تایبەت نییە بەهەندێ گەورە بەرپرسەوە، بەڵکو بووە بە نیمچە دیاردەیەکی پەیکەری و چۆتە ناو پێکهاتەی کۆمەڵگەی چینییەوە. پرۆسەی گواستنەوەی ناتەواو بۆ ئابووری بازاڕ هاوکات بوو لەتەك دیاردەی گەندەڵی رامیاری که خەریکە دەبێتە تەگەرەیەکی سەخت لەرێی پێشکەوتنی ئابووری چین و ڕەوایەتی ڕژێمە رامیارییەکە. ئەوەش سەرنج ڕاکێشە ئەو هۆکارانەی بوونە هۆی دیاردەی گەندەڵی رامیاری هەر ئەوانەن که تێکڕاگەلێکی پێشتر ڕوونەداویان وەدیهێنا له گەشەی ئابووری که دەگەیشتە نزیکەی ١١٪ ساڵانەو لەم ساڵانەی



دواییدا کشایەوە، ئەمەش وادەگەیەنێت که هەندێ لایەن له قەبارەی گەندەڵی رامیاری و هەڕەشەی بۆ سەر گەشەی ئابووریو ڕەوایەتی ڕژێمی رامیاری زل دەکەنەوە، بۆیە واپێویستە ئەم دیاردەیە بەتێڕوانینێکی بابەتی دوور له زلکردنەوە نیشان بکرێ.

ئەو سەرکەوتنە ئابووری و کۆمەڵایەتیانەش چین وەدیانیهێنا لەم ساڵانەی دواییدا سەرەڕای هەندێ دیمەنی گەندەڵی، دەتوانرێ بگەڕێنرێتەوە بۆ ڕێسای ڕۆشنبیری ریشەکوتاو له ژینگەی چینیدا.

## شێوەکانی گەندەڵی رامیاری له چین

سروشتی کۆڵینەوە له وێنەکانی گەندەڵی جیاکردنەوەی پێدەوێ له نێوان گەندەڵی رامیاری و گەندەڵی ئاسایی، چونکە گەندەڵکاری رامیاری له ئاستی دامەزراوە گشتییەکانی دەوڵەتدا دەکرێ. وەکو ئەوەی فەرمانبەرە حکومیەکان بەوەکارهێنانی دەسەڵات و جیاوکە رەسمییەکانیان سوود بگۆڕنەوە لەو شوێنانەی هەردوو کەرتی گشتی و تایبەتی بەیەك دەگەن، لەوانەیە فەرمانبەرەکان دەسبگرن بەسەر هەندێ دەرامەتی دەگمەن که دەوڵەت قۆرخی دەکات و بەرێگەی ناڕەوا ڕەوانەی کەرتی تایبەتی بکەن بۆ وەدیهێنانی سوودی هەردوولا. واتە زۆر بەکورتی یەك لایەنی بنچینەیی و تەنیا هەیە له دیاردەی گەندەڵی رامیاریدا ئەویش فەرمانبەرە حکومیەکانن.

هەرچی گەندەڵی ئاساییە ئەوە چەمکەکەی فراوان دەبێتەوە و شێوازی پەیوەندی تر دەگرێتەخۆ و دوور له دامەزراوە رەسمییەکان و بەیەك گەیشتنیان لەتەك کەرتی تایبەتیدا دەکرێت، و ئەمەش شێوەی سوود گۆڕینەوە دەگرێتە خۆی لەنێوان تاکەکان یان لەنێوان گروپەکان. بەحوکمی ڕۆڵی دەوڵەتیش له وەدیهێنانی گواستنەوە ئابوورییەکاندا ڕۆڵی زیاتری دەبێ له بڵاوکردنەوەی گەندەڵی بە تایبەتی

ڕامیارییەکەی، ئەمیش زۆر جار بەیەکداچوونی ڕێسا دامەزراوەییەکان لەتەك ڕێسا کۆمەڵگەییەکان دروستی دەکا، کاتێ فەرمانبەران لە ڕێسای یەکەمدا دەسەڵاتیان دەخەنەگەڕ بۆ وەدیهێنانی دەسکەوتی ناڕەوا لە تاکەکانی ڕێسای دووەم، ئەم دۆخەش لە ئەنجامی تێکەڵبوونی پەرەکانی هەردوو ڕێسای بەیەکداچوو نابێتە کەشێکی گونجاو بۆ گواستنەوە بۆ ئابووری بازاڕ. ئەمەش ڕێ لە لێپرسینەوەی تیژ دەگرێ، پێچەوانەکەش ڕاستە، واتە ئەگەر سنووری جیاکەرەوەی هەردوو کەرتی گشتی و تایبەتی روون و دیاریکراو بوو ئەوە پرۆسەی گواستنەوە باش دەچێتە ڕێوە دوور لە فراوانبوونی پەتای گەندەڵی رامیاری، کە بەلانی کەم چالاکیە ئابووریە سەرەکییەکان ناگرێتەوە.

لە قۆناغی «ماوتسی تونگ»دا مەسەلەکان بەیەکداچووبوون لە نێوان ئەوەی وا رامیاریەو ئەوەی وا کۆمەڵایەتیە، ئاسانیش نییە بۆ ئەو کەسەی دوای دامەزرێنەر دێ و بڕیاری ئابووری بازاڕی وەرگرت، ئەم پەیوەندیە هەڵوەشێنێ و ئەو بەیەکداچوونەی نێوان ڕێسای دامەزراوەیی و ڕێسای کۆمەڵگەیی نەیەڵێ، بۆیە سەرەڕای زۆر رۆیشتن لە چاکسازییە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان هێشتا دەوڵەت بەردەوام بوو لەسەر وەزیفە ئابوورییەکەی بێ بواردان بە کەرتی تایبەت تا جلەوی کاروبار بگرێتە دەست بەگوێرەی یاساکانی ئابووری بازاڕ، ئەمەش بەڕای هەندێ کەس بوو بەیەك لە هۆکانی گەورەبوونی دیاردەی گەندەڵی رامیاری لە چین.

بەڵام هەیشە وایدەبینێ کە دەسوەردانی دەوڵەت لە قۆناغی «ماو»دا بەئامانجی ڕێکخستنی چالاکی ئابووری و دامەزراندنی ئابووری لەسەر بنچینەی مادی و تەکنیکی پتەو بوو، کەچی دەسوەردانی دەوڵەت لە قۆناغی گواستنەوەدا بەرەو ئابووری بازاڕی سۆشیالیستی ئەوە ئامانجە ڕانەگەیەنراوەکەی وەدیهێنانی دەسکەوتی ناڕەوا بوو بۆ هەندێ گەورە بەرپرسی حکومی، کە لە نێوان ئەوان و پیاوانی کاردا پەیوەندی شوێنکەوتەیی دروست بوو، بۆنی سوودی تایبەتی



هەردووکیانی لێدەهات لەسەر زەمینەی شوان و شوێنکەوتوو وەکو ئەوەی بەرپرسانی بەرهەمهێنان و بەشینەوە دەسکەوتی مادی بۆ پیاوانی کار ئاسان بکەن بەرانبەر وەرگرتنی سوودی تایبەتی، واتە بەکاریگەری گرێبەستی ئاڵشتی نێوان هێزی دەسەڵات و بریسکەی سامان دیمەنەکانی گەندەڵی رامیاری بڵاودەبێتەوە. هێزی بیرۆکراتی لە زاڵبوونی دەوڵەت بەسەر تایبەتکردن و بەشینەوەو دەرامەتی پێویست بۆ وەبەرهێنان وەرگیراوە، وەکو قەرزو پێدانی زەوی و مۆڵەتی وەبەرهێنان و ڕازیبوون لەسەر هاوردن و هەناردن، هەروەها زانیاری لەبارەی چالاکی بازاڕی داراییەوە.

کەچی بریسکەی سامان «هێزی دارایی» ئەوە بەرهەمی بازاڕی ئازادەو هەندێ فەرمانبەری لەخشتەبردووە بۆ سوودلێوەرگرتنی بە ڕێگەی ناڕەوا بە وەکارهێنانی دەسەڵاتە حکومەتییەکانیان، بەرژەوەندی پیاوانی کاریش پێشکەش کردنی بەرتیل دەسەپێنێتە سەریان بۆ هەندێ بەرپرس تا تووشی ئاریشە نەبن.

لە سێبەری پەیوەندی شوێنکەوتووە بەشوانەوە دەتوانرێ گەندەڵکاری ئیداری و رامیاری بکرێ لە پەیوەندی فەرمانبەرە بچووکەکان بە گەورەکانیانەوە واتە، هەر کێ بەگوێرەی وەزیفەکەی سوودی ناڕەوا دەگۆڕنەوە، لەوەش پتر هەندێ فەرمانبەری حکومی خۆیان دەبنە خاوەن پرۆژەی تایبەتی بۆ قازانجی زیاتر بەبێ پێویستبوون بەدەڵاڵ، وەلێ هێشتا ئەو دووانەیە شێوازێکە لە شێوازەکانی گەندەڵی باو لە چین و لە وڵاتانی دیکەش وەکو سوریا.

هۆی گەورەبوونی دیاردەی گەندەڵی رامیاری لە وڵاتانی فرە ئابووریدا تەواو نەبوونی قۆناغی گواستنەوەیە بۆ ئابووری بازاڕ لەلایەك و لەلایەکی تر دووانەی پەیوەندی شوان و شوێنکەوتوو، بەڵگەش لەسەر ئەمە ئەو گەندەڵکاریانەیە کە فەرمانبەرە حکومیەکان کردیان لە چین و سوریا لە دەیەی نەوەدەکاندا لەسەر

ئاستی بانکە کشتوکاڵییەکان بە پێدانی قەرز بەبێ متمانە، سەرباری گەمەکردن بە کەرەسە کشتوکاڵییەکان وەکو تۆو و پەیین و ئالف ... هتد. هەروەها گەندەڵی رامیاری گەیشتە بواری بازرگانی و بازاڕی ڕەش دەرکەوت بۆ شمەکی رفێنراو و گۆڕینەوەی پارە بەرێگەی ناڕەوا.

## مافەکانی موڵکایەتی

مافەکانی موڵکایەتی کۆڵەکەو مەرجی سەرەکی هەبوون و بەردەوام بوون و ئارامی ئابووری بازارە، پێویستیشە ئەم مافانە ڕوون و ئاشکرا بن بۆ ئەوەی تاك و کۆمەڵ بزانن چیان بۆ هەیەو چیان لەسەرە تا بتوانن لە ڕۆشنایی یاساکان و پێرۆ کارپێکراوەکانی وڵات چالاکیە ئابوورییەکانیان هەڵبسوڕێنن، دۆخێکی ئاواش یارمەتی وەبەرخستنی درامەتەکان بەباشترین شێوەو وەبەرخستنی موڵکەکان تا دوا سنووری دەدات. ئادەم سمیس لە پێشەوەی ئەو کەسانە بوو کە وایان داناوە مافەکانی موڵکایەتی مەرجێکی پێشترە بۆ وەدەسهێنانی گەشەی ئابووری «دەوڵەتان پێرۆی متمانەو دیاریکردنی موڵکایەتی پەیڕەو دەکەن، هەر مرۆڤێکی تەواویش بە هەموو شێوازی بەکاریدهێنێ، لە گێلێتیەتی کەسێ لەو وڵاتانەی کە ئەو متمانەو دیاریکردنی موڵکایەتیەی تێدایە ئەو هەوڵانە نەدا».

مافەکانی موڵکایەتیش وەکو سەرەتا ئەو جیاوکانە دەگەیەنێ کە بۆ لایەنێکە لەسەر شتێ، بە گوێرەی ئەوەش دەتوانێ رەوشتی دیاریکراو بنوێنێ لەبارەی ئەو شتەوە، ئەم ماف و جیاوکانەش ئەمانە دەگرێتەوە: [٣٦]

١- مافی بەکارهێنانی ئەو شتە.

٢- مافی سوود لێوەرگرتن. واتە سوود وەرگرتن لە داهاتی ئەو بەکارهێنانە کە مەترسییەکانیش دەگرێتەوە وەکو قەرزاری.



٣- مافی دەسلێهەڵگرتن. واتە دەسهەڵگرتن لە بەکارهێنان و سوود وەرگرتن بۆ لایەنێ یان چەند لایەنێ تر بە فرۆشتن یان بە بەخشین.

ڕوونی مافەکانی موڵکایەتی سەرچاوەیە بۆ حوکم لەسەر ڕاستی ئەو هەنگاوانەی دەوڵەتێ دەینا لەبارەی دووبارە پەیکەربەندکردنی موڵکایەتی بەپێی میکانیزمەکانی بازاڕ، بۆ نموونە تایبەتکردن بەتەنیا نابێتە نیشانە بۆ ئابووری بازاڕ ئەگەر هاوڕێ نەبێ لەتەك مافێلێکی ڕوون بۆ موڵکایەتی، لەوەیە دەوڵەتێك رایبگەیەنێ کە وازی لە قورخکردنی موڵکایەتی هێناوە بۆ تاکەکان، لەکاتێکدا مافەکانی سوود لێوەرگرتن و دەسلێهەڵگرتن بۆ خۆی دەهێڵێتەوە، لەم حاڵەتەشدا تایبەتکردن ناوەڕۆکی لەدەسدەدات و قسەکردن لەسەر گواستنەوەی دەوڵەت بۆ ئابووری بازاڕ لە وەهمێك بەولاوە چیدیکە نییە.

لە حاڵەتی ڕوونی بنەما ڕێکخەرەکانی موڵکایەتیدا ئەوە ئەو ناڕوونیەی لە مافەکانی کردنە موڵکدایە دەبێتە کەشێکی گونجاو بۆ گەندەڵکاری رامیاری بە قۆزتنەوەی فەرمانبەرە حکومیەکان، بۆ ئەو هەلانەی دێنە پێشیان بۆ وەدیهێنانی دەسکەوتی ناڕەوا بەوەکارهێنانی دەسەڵاتە ڕەسمییەکانیان.

وڵاتی چینیش نموونەیەکی زیندووی بەیەکداچوون و ناڕوونی سنوورەکانی موڵکایەتییە لە ئەنجامی دەسوەردانی بەردەوامی دەوڵەت لە ڕێکخستنی مافەکانی موڵکایەتی، ئەمەش دژە بەخواستەکانی ئابووری بازاڕ لە سەرەتای هەشتاکاندا لە کەرتی کشتوکاڵ، «کومیۆنەکان» کرانە پێرۆی بەرپرسێتی خیزانی ئەمەش دووبارە پەیکەربەندی مافەکانی موڵکایەتی خێزانە جوتیاری لەخۆگرتبوو واشی لێکرد بتوانێ ئەو پارچە زەویەی بە گرێبەند لە دەوڵەتی وەرگرتبوو بەکاربێنێ، بەپێی گرێبەندێکی درێژخایەن دەگەیشتە ٣٠ ساڵ، بواریش درا بە خێزانە جوتیار سوود لە بەشێ لە داهاتی فرۆشتنی بەرهەمی کشتوکاڵی و گۆشتی ئاژەڵ وەربگرێ لەدوای وەجێهێنانی ئەو ئەرکانەی لەسەریانە بەرانبەر دەوڵەت، هەروەها ئەم پێرۆ

تازەیە بواری بە جوتیاردا موڵکەکەی لە زەوی کشتوکاڵی هەڵبسوڕێنێ بەوەجێهێشتنی بۆ کوڕەکانی یان فرۆشتنی یان دەسهەڵگرتن لە گرێبەندەکە بۆ جوتیارێ دیکە، بەڵام سەرەڕای ئەوەی ئەم مافانە ڕەنگدانەوەی پرۆگرامی چینە بۆ تایبەتکردنی زەوی کشتوکاڵی، ئەوە دەوڵەت هێشتا دەس لە سیاسەتی کشتوکاڵی وەردەدات وەکو پابەندکردنی جوتیاران بە چاندنی هەندێ بەرهەم یان بەخێوکردنی هەندێ ئاژەڵ وەك بەشێ لە پلانی کشتوکاڵی.

لەبارەی ئەو پرۆژە سەنعەتکاریانەی هەن لە شارۆچکەو گوندەکاندا کە مۆرکی هەرەوەزیان وەرگرتووە، چونکە خاوەنەکانیان لەهەمان کاتدا کرێکاریشن لە هەمان پرۆژەدا (واتە لە هەمان کاتدا بەشدارە لە خاوەنێتی پرۆژەکەو کاریشی تێدا دەکات)، ئەمانیش لەڕووی کردارەکیەوە حکومەتە خۆجێیەکان زاڵن بەسەریدا، تەنانەت لە سێبەری ئەو پێرۆ موڵکایەتیە هەرەوەزیەی بەشتیاکان کە حکومەت پەیرەوی دەکردو وای لێچاوەڕوان دەکرا خاوەنی بەشتیاکان مافیان پارێزاو بێ لە بەگەڕخستنی داهاتی پرۆژەکەو سوود لێوەرگرتنی، سەرباری هەڵسوڕانی بنچینەکانی «شتەکان»، ئەمەش لە ئەنجامی دەسوەردانی دەوڵەت کە لە ناوەڕۆکی ئەو مافانەی کەم کردۆتەوە، لەکاتێکدا خاوەنێتی دەوڵەت لەم پرۆژانەدا (٣٠٪) تێپەڕ ناکات کەچی ئەو بەڕێوەبەرەکان دادەنێت، ئەو دەسوەردانەش مافی بەکارهێنانی موڵکایەتی کەلەبچەکردووە لەوانەش مافی دەسهەڵگرتن لەبەشت یان بەگەڕخستنی لە دەرەوەی چوارچێوەی ئەو پرۆژەدا، ئەگەر کرێکارێکیش لەبەر هەر هۆیەك پرۆژەکەی بەجێهێشت ئەوە نابێ دەس لە بەشەکەی هەڵگرێ مەگەر بۆ کەسێ لە هەمان پرۆژەدا ئیش بکات.

هەرچی پرۆژە سەنعەتکارییەکانی دەوڵەتیشە کە لە ساڵی ١٩٩٤ پێرۆی موڵکایەتی بەشتیاکانی تێدا ئیشپێکرا، ئەویش دیلی دەسوەردانی دەوڵەتە کە دەسەڵاتەکانی لەڕێی بەڕێوەبەری کارگەکانەوە هەڵدەسوڕێنێت و مافی دانانیانی بۆ



خۆی پاراستووە، ئەمەش وای لێدەکات پرۆژەکە بەکاربێنێت و سوود لە داهاتەکانی وەرگرێ، دەوڵەتیش گۆڕینکاری لەو پێرۆیەدا کردووە بەشێوەیەك دەوڵەت تەنیا بەشدارێکە لە خاوەنێتی، بۆ خاوەن بەشتیاکانیش مافی بەکارهێنان و سوود وەرگرتن و دەسهەڵگرتنی داوە بۆ وەبەرهێن لەناو پرۆژەکە یان لە دەورەوەی، تەنانەت بۆ وەبەرهێنی بیانیش. بەڵام دەوڵەت گەلێ لاژەلاژەی پێوە دیار بوو لە پەیڕەوکردنی پێرۆ تازەکەدا هەندێجار چاوپۆشی دەکرد لە هەندێ پرۆژە بۆ فرۆشتنی بەشەکانیان، جارێ دیکە حەیای ئەو پرۆژانەی دەبرد کە وایان کردووە، ئەمەش گومانی دروستکردووە لەبارەی نیازەکانی دەوڵەت لە پەیرەوکردنی ئەو پێرۆ تازەیەدا.

ناڕوونی لە دیاریکردنی مافەکانی موڵکایەتی دەگەڕێتەوە بۆ گەندەڵی رامیاری کە لە ئەنجامی دوولایی پێوەرەکاندا دەکرێ، کاتێ دەوڵەت دەسەڵاتە ناوەندییەکەی لە هەندێ حاڵەتدا دەسەپێنێت و لە حاڵەتی تری هاوشێوەدا واناکا، لە ئەنجامی بەیەکداچوونی موڵکایەتی تایبەت و موڵکایەتی دەوڵەت، ئەم بەیەکداچوونەش پێرۆی سێیەمی مافەکانی دەرخستووەو تەنیا مافەکانی گەندەڵی تێدا دیاریدەکرێ، ئامارەکانیش دەریانخستووە کە (٢٠٪) خێزانە جوتیارەکان خۆیان لە باج دەدزنەوە بەهاوکاری لەتەك فەرمانبەرانی دەوڵەتدا.

لە سەرەتای هەشتاکاندا حکومەتی چین هەوڵی دانانی پێرۆیەکی دادگەیی سەربەستی دا کە لە کێشەکان بکۆڵێتەوەو ئەو حوکمانەش وا دەردەچن بیخاتە حاڵەتی جێبەجێکردن. ئەوجا دەزگە تەشریعییەکان زیندووکرانەوە و جیاکرانەوە لە دامەزراوەی رامیاری، وای لێهات ئەنجومەنی نیشتمانی نوێنەرانی گەل تەنیا شوێنکەوتوویەك نەبێ بۆ حزب و دەوڵەت، بەڵکو ڕۆڵی خۆی دەبینێ لە دەرکردنی پرۆژەی یاساکان، هەروەها دادگەی بەرزی گەل دەسەڵاتی تەواوی وەرگرت ئەمانەش نیشانەی باشن و شانازیان پێوە دەکرێ، ئەگەرچی هەندێ لە شارەزایان لە گرنگی و

تواناى بۆ بەدەنگەوەچوونی خواستەکانی ئابووری بازاڕ کەمدەکەنەوە، چونکە بەڕای ئەوان دەسەلاّتی یاسادانان هێشتا ئازادی جولاّنەوەی نییە بەهۆی زاڵی حزب بەسەریدا، هێشتا پرۆژەی یاسا گرنگەکان لە چێشتخانەی حزب و دەوڵەت لێدەنرێن، رۆڵی ئەنجومەنی نیشتمانیش تەواوکەرێکە بۆ ئەو کار و ڕێخستنانە، لەم بارەشەوە ئاماژەکردن بەسە بە «بنەما ڕێکخەرەکانی یاسای مەدەنی»، «یاسای پرۆژە ئابووریە هاوبەشەکان»، «یاسای دادگەیی کردنی گشتی»، «یاسای گرێبەندە ئابووریەکان» و «یاسای کەتنکاری گشتی»، کە بە پێشنیازی حزب و دەوڵەت دانراون، هێشتا کاریگەریان هەیە لەسەر دەسەلاّتی یاسادانان و ئەوانەی لە دەزگەی دادگەییدا ئیشدەکەن.

ڕژێمی رامیاریش لە مێژە وا ڕاهاتوە کە وەکو یەك لە ئامزارەکانی حوکم و هۆیەك بۆ جێبەجێکردنی بیروڕا رامیارییەکانی حزب و دەوڵەت سەیری دەسەلاّتی دادگە بکا، حاڵەتی ئاوهاش باوەڕ بەپاکی دادگە لاواز دەکات.

هێشتا دادگەکان دسبەسراون لە کێشەی گەورە بەرپرسانی حزب و دەوڵەت بەهۆی هەبوونی دەزگەی تایبەت، کە شوێنی دادگە دەگرێتەوە وەکو «لیجنەی ناوەندی بۆ چاودێری رژێم»، بۆیە دادگەکان نەتوانایی و خۆدزینەوەیان پیشاندا لەو کێشانەی یەك لایەنیان سەرکردەکانی حزب و دەوڵەتن، ئەمەش لە هەیبەتی پیرۆزی دادگەیی کەمکردەوە لە هەڵسانی بە ئەرکەکانی لە سێبەری بەیەکداچوونی ئەرکەکان و نائامادەیی پێوەرەکانی سزادان، ئەمەش ڕووبەری گەندەڵی پتر دەکات بەتایبەت کاتێ هەندێ بەرپرس دەبنە تەگەرە لەڕێی جێبەجێکردنی هەندێ حوکمی دادگەیی کە خۆیان لایەنن تێدا، ئەم جۆرە ژینگەش پرۆسەی گواستنەوە بەرەو ئابووری بازاڕ ئاسان ناکات.



## ناناوەندێتی رامیاری لە ڕووبەڕووبوونەوەی گەندەڵیدا

ناناوەندێتی لە ئیدارەدا بەڵگەی وازهێنانی دەوڵەتی چینە لە دەسەلاّتە ناوەندییەکەی هەتا ڕێگە خۆشکا بۆ ئابووری بازاڕ، ئاستە ئیدارییەکانی چینیش دوو جۆرن: [٣٧]

**یەکەمیان:** ئاستی ئابووری: لێرەدا دەوڵەت راهاتووە کە دەستوەربدا لە ژیانی ئابووری و دەسەلاّتی بەسەردا بسەپێنێ، بەوەی پێی دەوترێ سیاسەتی دەرامەت و تایبەتکردن و بەشینەوەی، سەرباری ئامادەکردنی بۆدجەو پلانی وەبەرهێنان و بەشینەوەی قەرزو بەخشینە داراییەکان.

**دوومیشان:** ئاستی رامیاری: دەوڵەتی چینی هەمیشە پاڵپشتی پەیوەندی نێوان ناوەندو خۆجێیەکانی دەکرد بەدانانی گەورە بەرپرسە خۆجێیەکان لە هەردوو دەزگەی حزب و دوڵەتدا ڕاستەوخۆ لەلایەن ناوەندەوە.

دەوڵەتی چینی بەم دوو ئاستە توانی تاماوەیەکی درێژ دەسەلاّتی لە هەر دوو لایەنی ناوەندی و خۆجێیدا بسەپێنێ، تەنانەت لە دوای چاکسازییە ئابوورییەکانیش گۆڕانی ریشەیی بەسەردا نەهات، هێشتا دەوڵەت جڵەوی کاری بەدەستە لە خۆجێیەکاندا، ئەمەش وا دەکا قسەکردن لەسەر ناناوەندێتی بێهودە بێ. بۆ زانینیش لە ساڵی ١٩٩٤ بڕیاردرا کە خۆجێیەکان هەندێ سەربەخۆییان پێبدرێ لە دابەشکردنی داهات و قازانجی پرۆژە خۆجێیەکان لەتەك دەوڵەتدا لەپاڵ پاراستنی مولّکایەتی بەشێکی ئەو پرۆژانە سەرباری ئازادی ئیشکردن بەداهاتەکانەوە جا ئەگەر لە فراوانکردنی بنچینە سەرمایەدارییەکان بێ یان لە باشکردنی ئاستی ژیانی، سەرەڕای ئەوەش دەوڵەت هەر زاڵە بەسەر خەرجکردندا لە هەرێمەکانی چیندا، ئەمەش وادەگەیەنێ کە ڕژێمی رامیاری وازی لە دەسەلاّتە ناوەندییەکەی نەهێناوەو چاکسازییەکانیش شتی زۆریان پێنەبوو بۆ سەربەخۆیی

ئیدارە خۆجێییەکان، بەڵکو دەوڵەت توانی هێزو زەبری پتر وەدەسبێنێ بە پتەوکردنی زاڵبوونی دارایی بەسەر خۆجێییەکاندا بەشێوازی ناڕاستەوخۆ، وەکو سەپاندنی باج بەسەر ئەو داهاتانەی دەس خۆجێییەکان دەکەون، هەروەها پێڕۆی قەرزی زۆرەملێی بەسەریاندا سەپاند بۆ قەرزدان بە پکین لەژێر ناوی جۆراوجۆرو پابەندکردنی خۆجێییەکانی بەکڕینی قەواڵە حکومیەکان بۆ بەرزکردنەوەی تێکڕاکانی وەبەرهێنانی نیشتمانی، واتە بە کورتی ئەوەی ناوەند بەدەستی ڕاست بەخۆجێییەکانی دا بەدەستی چەپ لێیانی وەرگرتەوە. لە سێبەری چاکسازییەکانیشدا هێشتا تای ناوەند قورسترە کە نەك هەر دەس لە ژیانی ئابووری وەردەدات بگرە لەلایەنی رامیاریش تا ئەو ڕادەی ٩٠٪ بەڕێوەبەری پرۆژەکان لە کادرەکانی دەوڵەت و حزبی کۆمۆنیستن و لە ناوەندەوە دادەنرێن، لەوێشدا گەندەڵی رامیاری بڵاوە لەو شوێنانەی خەرجی تێدا دیاریدەکرێ لە نێوان ناوەندو خۆجێیەکاندا و سەرپێچی زۆریش دەکرێ وەکو خۆدزینەوە لە باج، کە بڵاوترین دیاردەیە لە چیندا.

## گەشەپێدانی ئابووری و گەندەڵی

ئەو ژینگەی پرۆسەی گواستنەوەی تێدا بەڕێوە دەچێ بەرەو ئابووری بازاڕ گونجاو نییە بۆ گەشەی ئابووری لە چیندا، چونکە میکانیزمەکانی ئابووری بازاڕ روون نین و تەواویش نەبوون و لەوەیە زیان بە گەشەپێدانی ئابووری بگەێنن بەهۆی بڵابوونەوەی گەندەڵی رامیاری، بەڵام هەیە ئەم بیرۆکەیە پۆچەڵ دەکاتەوە، چونکە ناتەواوبوونی پێڕۆی ئابووری و بڵاوبوونەوەی گەندەڵی رامیاری ئەو تێکڕا بەرزەی گەشەی ئابووری لە خۆگرتبوو کە چین لەم ساڵانەی دواییدا وەدیهێنا بە بەراورد لەتەك وڵاتانی ئەوروپای ڕۆژهەڵات کە هەنگاوی بۆێرانەیان نا لە ڕێگەی



دیاریکردنی مافەکانی موڵکایەتی، وەلێ ئەنجامەکان هیوا بەزێنبوون بە بەراورد لەتەك چیندا، کە وادیارە هێمنترە لە گشت لایەنە ئابووری و رامیارییەکانەوە.

سەرەڕای ناتەواوبوونی سەرەتاکانی بازاڕی ئازاد وەکو پەیوەندی شوان و شوێنکەوتوو ئاماژەی پێدەکات و، سەرەڕای بڵاوی گەندەڵی رامیاری کە بووە هۆی بەفیڕۆچوونی دەرامەتەکان لەلایەن فەرمانبەرە حکومیەکانەوە بەرانبەر بە بەرتیل، سەرەڕای ئەو شتانە، هەیە وایدەبینێ کە ئەو دوو دیاردەیە نەبوونەتە هۆی بەفیڕۆچوونی دەرامەت و تێکچوونی بەرهەمهێنان لە هەندێ ناوچەی چیندا، بەڵکو پێچەوانەکەی راستە. رەنگیشە ئەمە نامۆ بێتە بەرچاو وەلێ ئەو ناڕوونیە هەر زوو نامێنێ، چونکە پەیوەندی شوان و شوێنکەوتوو لە بنەماکانی گەمەی بازاڕ کەمناکاتەوە بەڵکو شێوازێکە لە بازاڕ، لە چوارچێوەی پەیوەندی شوان و شوێنکەوتوو پرۆسەی گۆڕینەوەی شمەك و خزمەتەکان دەکرێ لەسەر بنەمای گۆڕینەوە لە نێوان دەسەڵات و پارەدا وەکو هەر گۆڕینەوەیەك لە بازاڕی ئازاددا.

باوەڕ بەیکترو بەرژەوەندی هاوبەش لە نێوان پارەو دەسەڵات (شوان و شوێنکەوتوو) پەیوەندییەکەیان پتەوتر دەکات دوور لە ترس و دڵەڕاوکێ کە هەڕەشە لەم چالاکیە دەکات، تەنانەت لە حاڵەتی ناڕوونی هەلومەرجی پرۆسەی گواستنەوەکەش بۆ بازاڕی ئازاد. بەکردەی هەبوونی رەگەزی باوەڕ لەو پەیوەندیەدا دەبێتە پەیوەندییەکی بەکەڵك بۆ هەردوو لایان، ئاسایش و هێمنیش ئامادە دەکات بۆ خاوەن پرۆژەکان (شوێنکەوتووان). بەسوودییەکەشی ئەوەیە یارمەتی و پاڵپشتی شوان بۆ شوێنکەوتوو دابیندەکات بەبێ هەبوونی مەرجی کرێدانی بەپەلە، ئەگەر شوێنکەوتوو پێویستی بەیارمەتی شوان هەبوو بۆ ئیشی بەپەلە، ئەوە شوان مەرجی بۆ دانانێت چونکە باوەڕی پێی هەیە کە لەکاتی دیکەدا بەرانبەر وەردەگرێ، بۆ خاوەن پرۆژەش یەك فەرمانبەری دامەزراوەی حکومی بەسەو دواتر بازنەکە ژمارەیەتر لە فەرمانبەرە بیرۆکراتییەکان دەگرێتەوە.

بەڵام خەڵك هەیە لەوەش دوورتر دەبینن، دیارە پەیوەندی شوان و شوێنکەوتوو بەسوود نییە بۆ تەنیا لایەنێك، بەڵکو بەسوودیشە بۆ پەلەکردن لە پرۆسەی گواستنەوە بۆ ئابووری بازاڕ بە [٣٨]:

- هاندانی رکابەری لە نێوان پیاوانی کاردا بۆ بەرزکردنەوەی برو جۆری بەرهەم ئەمەش وەدینایەت بۆ خاوەن پرۆژەکان بەدانی بەرتیل نەبێ بۆ بەرپرسەکان، بۆئەوەی بەتواناترین بۆ رکابەری و ئەو قازانجە وەدیبێنن کە جیاوکی زیاترو لێخۆشبوونی زیاتری هەبێ لەلایەن بەرپرسانەوە، کە ئەگەر وانەکەن ئەوە دەسکەوتە مادییەکانی شوێنە رسمییەکەیان لە دەسدەدەن.
- هاندانی داهێنان و نوێکردنەوە بەتێپەڕاندنی تەگەرە بیرۆکراتییەکان، کە گواستنەوەیەکی جۆرایەتی کرد لە بواری چالاکی تایبەتیدا.
- هاندانی پرۆسەی وەبەرهێنان بە رزگاربوونی لەسەرخۆ لە دەڵالێ بۆ دانانی پرۆژەی بەرهەمهێنەری ئارامگرتوو، بەڕای «وانك» پەیوەندی شوان و شوێنکەوتوو پەردەیە بۆ پاراستنی خاوەن پرۆژە تایبەتییەکانی ئاوایی لە سزادانی ناوەند لەبەر پابەندنەبوونیان بە جێبەجێکردنی پلانی دەوڵەت، واتە پەیوەندی شوان و شوێنکەوتوو هێمنی بۆ چالاکی کەرتی تایبەت دابین دەکات، هێمنیش مەرجێکی سەرەکی ئابووری بازاڕە.

هەندێ لێکۆڵەر سەرکەوتنە ئابوورییەکانی گوندیان دەگەڕاندەوە نەك هەر بۆ گرێبەستی شوێنکەوتەیی، بەڵکو بۆ بەهێزی گرێبەستە خێزانییەکانی ئاوایی، فەرمانبەری حکومی لە دێوە هاتوو هەستدەکا پاڵدەنرێ لەژێر کاریگەری خزمایەتی بۆ خزمەتی خێزانە جوتیارەکان، بەلانی کەم پاراستنیان لە ملهوری گەورە بەرپرسان، ئەم رەوشتانەش بەسوودە پتر لەوەی وروژێنێ ئاریشە بێ. بەم واتایە کەلەپوری چینی دوورابیەکی کۆمەڵگەیی دا بە پەیوەندی شوان و



شوێنکەوتوو کە یارمەتی پەلەکردن و ئاسانکردنی گواستنەوەیدا بۆ ئابووری بازاڕ. ئەمەش وادەگەیەنێ کە پەیوەندی شوان و شوێنکەوتوو یان پارەو دەسەڵات نە شەڕێکی پەتیەو نەخێرێکی پەتی، مەسەلەکە دەوەستێتە سەر ئەو ژینگەی حوکمی دەکات. ئەو گەشە ئابوورییە بەرزەی لە چیندا وەدیهات لە سێبەری بڵاوبوونەوەی گەندەڵی رامیاری گرێبەست بە پەیوەندی شوان و شوێنکەوتوو، دووبارە پێداچوونەوەی هەڵسەنگاندنی دوورایی سلبی گەندەڵی رامیاری دەسەپێنێ، هەروەها دەبێ لە سوچێکی وەزیفیەوە تەماشا بکرێت و ناشبێ لە ئەزموونی چینەوە وایدابنێین کە رووبەڕووی هەر ڕژێمێکی رامیاری دەبێتەوە.

مەسەلەیەکی سەرەنج راکێشی تر ئەوەیە کە چین سەرەڕای ناڕوونی سنووری موڵکایەتی تێکڕاگەلێکی پێشتر روونەداوی وەدیهێناوە لە گەشەی ئابووریدا بەتایبەت لە بواری بەشبەحاڵی لە دانەوێڵەدا لە ساڵی ١٩٩٦، باشکردنی دەسهاتی راستەقینەی جوتیاران بەپلەی١٠٪، هەروەها لێزانی بەرهەمهێنانی کەرتی گشتیش باشبوو کە نزیکەی ١٦ ملیار دۆلار قازانجی وەدیهێنا لە ساڵی ١٩٩٧، توانیشی تێکڕای گەشەی ساڵانە لە سنووری ٧,٥٪ بپارێزێ سەرەڕای ناڕوونی مافەکانی موڵکایەتی، بۆیە پێویست بە پێداچوونەوەی پەیوەندی گرێبەستی نێوان مافەکانی موڵکایەتی و نێوان تێکڕاکانی گەشەی ئابووری دەکات.

هۆی ئەو گەشە ئابوورییەی چین لەم ساڵانەی دواییدا وەدەستی هێنا ئارامی کۆمەڵایەتیشە و ئەو هاوتاییەشە لە پرۆسەی بزاوتی کۆمەڵایەتیدا، ئەمەش هانی تاکەکان و گروپەکان دەدات بۆ بەرزکردنەوەی تێکڕاکانی گەشەی ئابووری بۆ ئاستێکی دیار، بەچاوپۆشینیش لە پۆلێنکردنەکانی رۆژئاوا بۆ کۆمەڵگەی چینی بۆ پارێزگاران و رادیکاڵان و لیبراڵان، ئەوە پاشماوەی کولتووری چینی هێشتا زاڵە بەسەر رەوشتی زۆربەی چینییەکاندا، لە راپرسیەکیشدا لە دوای رووداوەکانی «تیان ئان مین» لەبارەی هەڵوێستی خەڵك لە رووداوەکەو ئایە حەزیان لە دیمۆکراتییە

لەتەك ئاژاوەدا یان مانەوەی رژێمی رامیاری لەسەر حاڵەتی خۆی لەتەك ئارمیدا، دەرکەوت زۆربە حەزیان لە ئەگەری دووەم بوو.

بەم شێوە وادیارە کە خودی دیاریکردنی مافەکانی موڵکایەتی شتێکی حەزلێکراو نەبوو بۆ سەرکردایەتی چینی، سەرەڕای گرنگێتییەکەی بۆ پرۆسەی گواستنەوە بەڵکو بۆ وەدیهێنانی هێمنی کومەلآیەتی پێویست بوو، کە سەرکردایەتی چین بایەخی زۆری پێدەدات، یەك لە گەورە بەرپرسانی دەوڵەت وتی «ئەقڵ نایگرێ سبەی بڕیارێ دەرکەین بۆ گواستنەوەی موڵکایەتی کارگەکان بۆ کەرتی تایبەت و دووسبەیش ملیۆنان کرێکار ببینین بەبێ ئامرازی ژیاندن ... ئەمە ئەرکی ئێمەیە هەر هەڵیشی دەگرین». بەلآم بایەخدانی چین بە هێمنی کۆمەلآیەتی نەبووە رێگر لەپێش بەردەوام بوون لە چاکسازییە ئابوورییەکان، بە شێوەیە لەسەرخۆ و پلەبەپلە بواربدا بە سوودوەرگرتن لە باشەکانی و وەلاخستنی خراپەکانی ئەوانەی لە ولآتانی یەکێتی سۆڤییەت و ئەوروپای رۆژهەلآتدا تەقینەوە لەئەنجامی پەلەکردن لە چاکسازییە ئابوورییەکاندا.

چاکسازییەکانی چین بە چەند یەکەیەکی ئەزموونی دەستی پێکردو سیاسەتە ئابووریەکانی بەسەردا جێبەجێکران و ئاریشەکانی تێدا نیشانکرا بۆ راستکردنەوە یان گۆڕین. لە ڕاستیشدا ئەو هێمنیە کۆمەلآیەتیە تێکڕاگەلێکی پێشتر روونەداوی وەدیهێنا لە گەشەی ئابووریدا، سەرباری ئامادەکردنی ژینگەیەکی رێژەیی لە هێمنی بۆ وەدیهێنانی چاکسازیە ئابوورییەکان. ئەوەش ئەزموونی چینی جیادەکاتەوە ئەو تێهەڵکێشەیانە لە نێوان پێداویستیەکانی چاکسازی ئابووری و پێداویستیەکانی هێمنی کۆمەلآیەتی، ئەم شێوازەش پشتگیری و پەسەندیشکرا لەلایەن گەلەوە، ئەمەیە نهێنی ئەو سەرکەوتنانەی لە ئابووری چیندا وەدیهات، سەرەڕای ناڕوونی مافەکانی موڵکایەتی.



وەلێ ناڕوونی مافەکانی موڵکایەتی نەبووە رێگر لە بەردەم هەوڵی تاکەکان بۆ بەرزکردنەوەی تێکڕاکانی گەشەکردن و بەرهەمهێنان، هەروەها هەبوونی گەندەڵی رامیاری بەری گواستنەوەیە بۆ ئابووری بازاڕ، بەڵکو رەنگدانەوەی حەزی فەرمانبەرە حکومییەکانیشە لە سوودوەرگرتن لە چاکەکانی چاکسازیە ئابوورییەکان، کاتێکیش فەرمانبەرەکان دەستیان تێکەڵکرد لەتەك خێزانە جوتیارەکان لە هەرێمە هەژارەکاندا، گەندەڵی رامیاری ئەرکی خۆی وەجێهێنا لە خۆدزینەوەی جوتیاران لە باجدانێك کە هاوڕێژە نییە لەتەك بەرهەمی راستەقینەیان.

گەندەڵی رامیاریش کە دەکرێ وەزیفی بێ لە هەندێ هەلومەرجدا، لە پشتی سەرکەوتنی کەرتی گشتی سەنعەتکاریەوە بوو لە وەدیهێنانی قازانجی روو لە زیادی لە ساڵی ١٩٩٧، لەهەمان کاتدا زیانەکانیشی روو لە کەمی بوو، هەمان شتیش لە سێبەری دەسوەردانی دەوڵەتدا روویدا بۆ لەکارخستنی حوکمی کەوتنە سەر ساج عەلی کە دژی ژمارەیەکی زۆر لە پرۆژەکانی دەوڵەت وەرگیرا، پاکانەی ئەو دەسوەردانەش پاڵپشت دەبینێتەوە لە هەڵوێستی سەرۆکی چین «چیانگ زیمین» لە پێڕۆی یاسایی، کە ئەرکی ئاسانکردنی پرۆسەی چاکسازی ئابووری و پاراستنی پێڕۆی کۆمەلآیەتی باش و هێمنی رامیاری گونجاوی بەو پێڕۆ یاساییە سپاردووە، بەو تێروانینەش پێڕۆی یاسایی مەرج نییە لە سێبەری جیاکردنەوەی دەسەلآتەکاندا ئیشی خۆی بکا، بەڵکو پێڕۆی یاسایی نموونەیی ئەوەیە کە رەنگدانەوەی ئەو پێداویستیانە بێ کە تێیدا دەردەکەوێت و هەوڵی سەپاندنی پێڕۆی دەرەکی نادات، کە بەدەنگی خواستەکانی واقعەوە ناچێ.

حزبی چینیش بەلانی کەم لە مەودای بینراودا حەزی لەوە نییە واز لە ڕۆڵی خۆی بێنێ لە دانانی یاساو لێکدانەوەی یان والآکردنی دەستی دادگە لە دەرکردنی حوکمی دادگەیی و جێبەجێکردنی، ئەگەر ئەمەش روویدا لەوەیە شوێنەواری کۆمەلآیەتی خراپی لێبکەوێتەوە. بۆ نموونە ئەگەر حوکمە دادگەیەکان لەبارەی کەوتنە سەر ساج عەلی کارگەکانی دەوڵەت جێبەجێکرا ئەوە ملیۆنان کرێکار

زیانیان لێدەکەوێت و بێکار دەبن، لەبری ئەمەش سەرکردایەتی چین دەسەڵاتی زیاتری دا بە بەڕێوەبەری ئەو کارگانەو هاندەری مادی دا بە کرێکاران بۆ بەرزکردنەوەی تێکڕاکانی بەرهەم لە بری هەندێ کاروەڕێخستنی دادگەیی کە زیانی لە سوودی زیاترە.

لەبەر هەندێ لاوازی پێڕۆی یاسایی بەهۆی جیانەکردنەوەی دەسەڵاتەکان ڕەنگە لە هەندێ حاڵەتدا لایەنی باشەی هەبێ، چونکە بواری جوڵانەوە بەسەرکردایەتی دەدات لە هەلومەرجی گوازراوەی فرە ئاڵۆزو ناڕووندا، ئەگەرچی حاڵەتی لەو جۆرە هانی گەندەڵکاری رامیاریش دەدات. لەکاتێکدا دەسەڵاتی گشتی خزمایەتی و ناسیاری رەچاودەکات لەوانەیە یارمەتی پاراستنی هاوتایی کۆمەڵایەتی بدات. لێکۆڵینەوەکانیش دەریانخستووە کە دەسوەردانی ناوەند لە کاروباری خۆجێیەکان پاشقولی تێکڕاکانی گەشەی ئابووریانی نەداوە، سەرەڕای ڕێژەیی سرەبەخۆییە داراییەکانیان، بوونی دەسەڵاتی داراییش بەدەستی ناوەندەوە کە ڕێی پێداوە لە کاتی گونجاودا دەسوەربدا، یارمەتی وەلاخستنی هەندێ شوێنەواری خراپی داوە لە قۆناغی گواستنەوە دا بۆ ئابووری بازاڕ.

ڕووداوەکان دەریانخست کە پەیوەندی ناوەندو خۆجێیەکان پەیوەندییەکی بڕی نییە، واتە زیادبوونی دەسەڵاتی ناوەند مەرج نییە کەمبوونی دەسەڵاتی خۆجییەکان بگەیەنێ، کە هێشتا گوێڕایەڵی ناوەندن بە ئامانجی وەدەسهێنانی چاکسازیە ئابووریەکان، هەروەها گەندەڵی رامیاری لە هەندێ حاڵەتدا لەوەیە «وەزیفی» بێ کاتێ یارمەتی پتەوکردنی ئەو هاوتایە کۆمەڵایەتییە دەدات، کە پرۆسەی چاکسازی ئابووری و ئیداری هەڕشەیان لێدەکات. هەروەها ئەزمونی چین سەلماندی کە تەواو نەبوونی قۆناغی گواستنەوە بۆ ئابووری بازاڕ سەرکەوتنە ئابوورییەکانی چین ڕووندەکاتەوە، لەسەر ئەوەش دیاردەی گەندەڵی رامیاری کە بەرهەمی قۆناغی گواستنەوە بوو بۆ ئابووری بازاڕ مەرج نییە مۆرکی خراپی هەڵگرتبێ بەڕادەی ئەوەی ڕۆڵێکی وەزیفی بینیوە.



## گەندەڵی و ڕەوایەتی ڕژێمی رامیاری

هەندێ کەس وایبۆچوون کە بڵاوبوونەوەی گەندەڵی رامیاری لە رەوایەتی ڕژێمی رامیاری کەمدەکاتەوە و هەڕەشەش لە بەردەوام بوونی دەکات، بەڵام لە حاڵەتی چیندا چەندین هۆکار هەن کە قورساییەکەی سوك دەکەنەوەو شوێنەوارە خراپەکانیشی وەلادەخەن، لەوانەش :

١ـ وەجێگەیاندنی دیارو سەرکەوتووی ئابووری چین، لە سێبەری هەبوونی گەندەڵکاری رامیاری و لاوازی دیمۆکراتی رامیاریشدا.

٢ـ پاچینەیی لە پەیرەوکردنی چاکسازیە ئابوورییەکان هاوڕێ لەتەك حەزی راستەقینەی ڕژێمی چینی بۆ گواستنەوە بەرەو ئابووری بازاڕو، توانای ئەو ڕژێمە لە وەدیهێنانی هێمنی و هاوتایی کۆمەڵایەتی.

٣ـ پاهەڵنانی ڕژێمی چینی لە هەڵمەتی پاکسازی ئیداری و بەگژاچوونی گەندەڵی رامیاری.

٤ـ بەها کولتوورییە بۆماوەیەکان کە بە سوکی تەماشای ئاژاوە دەکەن و رك لە هێمنی دەدەن.

٥ـ دەرکەوتنی سەرەتاکانی کۆمەڵگەی مەدەنی کە ڕێی خۆی دۆزییەوە بۆ بەشداربوون لە ژیانی گشتی وڵاتدا.

٦ـ وەلاخستنی ئەو کۆت و کەلەبەرانەی کۆمارەکانی یەکێتی سۆڤیەت و ڕۆژهەلاتی ئەورووپای تێکەوتن.

لەبەر ئەم هۆیانەو هی دیکەش دیاردەی گەندەڵی رامیاری هەڕەشە نییە بۆ سەر رەوایەتی ڕژێمی رامیاری هەتا لەتەك تەواو نەبوونی بەرنامەی چاکسازییە ئابوورییەکان و هەوڵی دامەزراوە رسمییەکان و یەکتربڕیان لەتەك کەرتی تایبەتدا کە شێوەی سوود گۆڕینەوە وەردەگرێ لەنێوان تاکەکان یان گروپەکان.

چەندین گۆمەڵگەی گەشەسەندوو ناڵاندویەتی بەدەست دیاردەی گەندەڵیەوە و هیلاکی کردووەو زۆربەی دانیشتوانیشی دابەزاندۆتە خوار هێڵی هەژاریەوە، لە کاتێکدا سەرکردەکانیان بێشەرمانە باس لە پاکی و ڕاسترەوی و ئەخلاقی پەسەند دەکەن، لە ژێرەوە گەندەڵکاری دەکەن و لە سەریشەوە بەگژداچوونی ڕادەگەیەنن.

لەم ساڵانەی دواییشدا پارت و بزاڤە رامیارییەکان لە بەرنامە رامیارییەکانیان و هەڵمەتی هەڵبژاردنەکانیاندا بەگژاچوونی گەندەڵی ڕادەگەیەنن، ڕاپەڕینە جەماوەرییەکان و هەڵگێڕانەوە سەربازییەکانیش شەڕکردنی گەندەڵییان کردۆتە ناوونیشانی هەڵگیرساندنیان، دەشتوانین گەندەڵی بەهۆی ڕوخاندنی چەندین ڕژێمی ڕامیاری دابنێین لە جیهاندا.

واش دیارە گەندەڵی وەکو پەتا وایە پیڕۆ دیمۆکراتییەکان و نادیمۆکراتییەکانیش دەگرێتەوە، بەڵام لەوانەی یەکەمدا بەکاریگەری ڕاگەیاندنی ئازاد، کە یارمەتی دۆزینەوە و حەیابردنی دەدات ڕووبەری گەندەڵی تەسك دەبێتەوە، کەچی فراوان دەبێتەوە لە ڕژێمە دکتاتۆرییەکاندا لە ئەنجامی نەبوونی کەشی دەستووری و کەلەپچەکردنی ڕۆژنامەی ئازاد. لەوکاتەشدا گەندەڵی دەبێتە دیاردە و زیان بە زۆرینەی خەڵك دەگەیەنێ کە تووشی بێئومێدی دەبن و وازدێنن لە بەشداری هەڵبژاردنە گشتییەکان کە پاڵێوراوێلێکی بۆ دەچن تەنیا ختورەیان وەدیهێنانی بەرژەوەندی تایبەتیانە.



## تایبەتکردن و گەندەڵی

تایبەتکردن لە دەوڵەتێکی وەکو کۆریادا هاوڕێ بوو لەتەك گەندەڵی، لەوێ چەندین کۆمپانیای ڕۆژئاوایی وەکو «گۆڵدستار» و هی دیکەش یارمەتی ڕامیاریان ڕاگەیاند بۆ پارتە نەیارەکان ئەگەر پەستان بخەنە سەر حکومەت بۆ بەرەو پێشچوون لە ڕێگەی تایبەتکردنی کەرتی حکومیدا، ئەمەش بەرهەڵستی کرا لەلایەن سەندیکا کرێکارییەکانەوە لە ترسی بڵاوبوونەوەی بێکاری.

یارمەتی دارایی ڕۆڵێکی گەورە دەبینێ لە بۆچوونی ئەو پارت و بزاڤە ڕامیاریانەی کە خۆیان پێشتر لە شلەژانی دامەزراوەییدا بوون، چونکە زۆربەی ئەو پارتانە گرێبەستن بە کەسێتی دیاریکراو نەك بە بڕواو ئایدۆلۆجیاوە، پرۆسەی هەڵبژاردنی سەرکردەی پارتەکان و کەسێتیە گشتییەکانیش یارمەتی دارایی دیاری دەکات پتر لە لێزانین و پێشینەی ڕامیاری، بۆیە ڕێکەوت نییە کە گەندەڵی لە لوتکەی هەرەمی ڕامیاریدا چەقی بەستووە. شۆڕشی خوێندکارانی کۆریا لە نیسانی (١٩٦٠)دا بەڕووی ئیدارەی بۆگەنی سەرۆك «سیگمان ری» و هەواڵگری ناوەندی کۆری و پاسەوانانی سەرۆك و ناوپۆشەکەیدا تەقیەوە. هەروەها سەرۆك ««سوان دوهون» ملکەچی لێپرسینەوە کرا لە بەردەم کۆمەڵەی نیشتیمانیدا، لەبەر خێرایی بەکاهێنانی دەسەڵات و بڵاوبوونەوەی گەندەڵی لە ئیدارەکەیدا کە حەوت ساڵی خایاند.

هەندێ دەوڵەتی ئاسیایی وەکو «هۆنگ کۆنگ» و «سەنگافورە» سەرکەوتن لە سنووردارکردنی گەندەڵیدا، کەچی هەندێکی دیکەیان بەدەستیەوە دەناڵێنن وەکو «کۆریا»، «تایوان» تا ئەو ڕادەیەی هەندێ کەس کۆریای باشور بە «کۆماری گەندەڵی گشتگیر» ناو دەبەن، چونکە هەموو شتێ بە بەرتیل ڕێدەکا، گەلی کۆریاش بێزیان لە دەوڵەمەندان دێتەوە و بە «کۆمەڵێ دز» ناویان دەبا. لە تایوانیشدا کۆکردنەوەی سامان گرێبەستە بەگەندەڵییەوە کە حکومەت و پیاوانی کاری هەراسان کردووە لە بارەی داهاتووی پڕ لە مەترسی.

### وێنەکانی گەندەڵی سیاسی

لە وڵاتانی ئاسیادا گەندەڵی فرە شێوەی هەیە، وەکو کڕینی ویژدانی حزبەکان و دەلاڵی و ناسیاری و ناڕەوا بەکارهێنانی دەسەڵات لەلایەن بەرپرسانەوە، بەکورتیش باسی شێوەکانی گەندەڵی لە کۆریای باشورو تایوان دەکەین.

### گەندەڵی لە ناو گەورە بەرپرساندا

پێڕۆی سەرمایەداری پەیوەندیەکی ناپیرۆزی لێبووەوە لە نێوان دەسەڵات و پارەدا، شێوەی ئاڵشتی وەرگرت لە نێوان پیاوانی رامیاری و پیاوانی کاردا ئەوەی کە سەرۆکی پێشووتری کۆریا «کیم یوگن سام» ئاشکرای کرد و هەڵمەتێکی بەرپاکرد دژی گەندەڵی و گەندەڵکاران و بەرتیلخۆران، لەژێر دروشمی «حکومەتێکی پاك»، گەلی کۆریاش تووشی سەرسوڕمان و نائومێدی بوون و داوای ئاشکراکردنی ڕاستیان دەکرد لە بارەی کاسبی ناڕەوای گەورە بەرپرسان، کە باوەڕی خەڵکی بەحکومەت و ڕەوایەتییەکەی لاوازکرد، سەرباری ئەو ئیفلیجیەی تووشی وەبەرهێنان هات، «ڕوتای وو»ش دانینا بە وەرگرتنی بەرتیل و کاسبی ناڕەوا، هەروەها ئاریشەیەکی زۆری دروست کردووە بۆ هەندێ لە پیاوانی کارو یارمەتی نایاسایی وەرگرتوە لە کۆمپانیاکانەوە بەرانبەر گرێبەند و جیاوکی حکومی، بۆنموونە لە «هیوندای» و «سامسۆنگ» (٣٢,٧) ملیۆن دۆلار، لە «دایوو» (٣١,٤) ملیۆن دۆلار و «گۆڵدستار» (٢٧,٥) ملیۆن دۆلاری وەرگرتووە.

واش مەزەندە دەکرێ کە سەرۆکی پێشوو «ڕوتای» پارەیەکی زۆری کۆکردبێتەوە لە بەخشینە ڕامیارییەکان، بەڵام لە ماوەی حوکمە پێنج ساڵێکەیدا دووبارە دابەشی کردووە و زۆربەشی بە سەر هەڵمەتەکانی هەڵبژاردن و زاڵبوون بەسەر هێزە ڕامیارییە هاوپەیمانەکاندا خەرج کرد.



ئەوجا «کیم یۆنگ سام» هات و دروشمی دیمۆکراسی و ئاشکراکاری و ڕیشەکێشکردنی گەندەڵی بەرزکردەوە، داوای بنیاتنانی «کۆریای نوێی» کرد لەسەر بنچینەگەلی نوێی یاسایی دوور لە گەندەڵی و، هەروەها هەڵوەشاندنی دیاردەی پاکردنەوەی پارە. «کیم یۆنگ سام» تۆمەتی سەرپێچیکردنێك کە بۆنی گەندەڵی لێدەهات ئاراستەی دوو سەرۆکی پێشووی کرد، سەرەڕای پاڵنەرە خاوێنەکانی، کەچی «کیم یۆنگ سام» ڕووبەڕووی ڕەخنەی توند بووەوە بەهۆی پشتگیری کردنی بۆ هەندێ دیاردەی گەندەڵی و چاوپۆشین لە ئیشە ناڕەواکانی خزمەکانی، سەرباری گرتنی یەکێ لە یاریدەرە نزیکەکانی بەتۆمەتی وەرگرتنی ملیۆنان دۆلار وەکو بەرتیل. لە (١٩٩٧/٥/١٧)دا تومەتی خۆدزینەوە لە باج و وەرگرتنی (٣,٦) ملیۆن دۆلار ئاراستەی کوڕەکەی «کیم» کرا، ئەویش کوڕەکەی لە بارەگەی سەرۆکایەتی دەرکردو بێئاگایی خۆی پیشاندا لە چالاکییەکانی. لەتەك داڕووخانی کۆمپانیای ئاسنی «هانبو» دا (١١) کەسێتی لە نێوان ڕامیاریکار و پیاوی کاردا ئاشکرا کران و تومەتبارکران بە ئامادەکردنی ملیاران دۆلار وەکو قەرز بۆ پرۆژەی «فیلی سپی» کە یەك لە گەورەترین خرپوونەوەکان لە ناو دەوڵەتدا جێبەجێ دەکات بەرانبەر پارەیەکی زۆر لەو بانکانەی بەدەست دەوڵەتەوەن، سەرەك وەزیران و هەندێ ڕامیاریکاری نزیك لە سەرۆك و کوڕەکەشی دەستیان تێدا هەبوو، هەروەها تۆمەتی یارمەتیدانی هەڵمەتی هەڵبژاردنی «کیم» یش لە ساڵی (١٩٩٢) دا ئاراستەی «هانبو» کرا، لە ئەنجامی ئەم هەڵسوڕانە ناڕەوایانەدا، نەیاران ڕژێمیان بە خەڵەتاندن تۆمەتبار کرد، چونکە لە ماوەی «کیم» دا پەیوەندی دەسەڵات و پارە بەردەوام بوو، بڕو بکوژیش تەنیا سەرۆك بوو لە کاروباری گشتی دەوڵەتدا وەکو مۆڵەتدان بە پیاوانی کار، قەرزی بانکەکان، بەدواداچوونی کێشەی خۆدزینەوە لە باج، تەنانەت کێشەکانی گەندەڵیش، تا ئەو ڕادەی وەزیرەکان لە ماوەی «کیم» دا بوونە فەرمانبەر و فەرمانیان لەوەوە وەردەگرت و جێبەجێیان دەکرد.

## پارە و دەسەلآت

کۆمپانیا سەنعەتیە گەورەکان یارمەتی حزبەکان دەدەن لە کاتی هەڵبژاردندا بە هیوای دەسکەوتی زیاتر و پاراستنی بەرژەوەندییەکانیان لە توڕەیی ئەو حیزبەی دەگاتە سەر حوکم، چونکە ئەو کۆمپانیانەی گوێ بە حیزبەکان نادەن تووشی تۆڵەسەندنەوە دەبن وەکو سەپاندنی باجی و نەدانی مۆڵەت.

ئەزموون دەریخستووە کە ژیانی رامیاری لە کۆریای باشووردا پشت بە پارە دەبستێ پتر لە ئایدۆلۆجیا، پرۆسەی هەڵبژاردنی پالێوراوان و دامەزراندنی گەورە فەرمانبەرانیش پێش و پاش هەموو شتێ دەوەستێتە سەر پارە، بۆ نموونە ئەوەی بیەوێ ببێتە ئەندامی کۆمەڵەی نیشتمانی لە سەرێتی (٢) ملیۆن دۆلار خەرج بکا. دوای گۆڕانکاریە دیمۆکراتییەکانیش لە کۆریادا شێوازی پێشکەش کردنی یارمەتی بۆ حزبەکان ئالۆزو پڕ لە مەترسی بوو، بەڵام بەردەوام بوو سەرەڕای ئەو رێکسازیانەی سەپێنرا بەسەریدا بۆ ئەوەی رووی یاسایی وەرنەگرێ لە دوو لایەنەوە:

یەکەم: ئەو یارمەتیانە پێشێلکردنی یاسا رێکخەرەکانی هەڵبژاردنە.

دووەم: ئەو یارمەتیانە بەبێ رازیبوونی خاوەنی کۆمپانیا و کۆمەڵە سەنعەتییەکانەوە پێشکەش دەکرێ.

بۆیە کۆمپانیا گەورەکان هەندێ سەربەخۆییان هەبوو، بوێرتریش بوون لە رووی حکومەتی «کیم یۆنگ سام»دا و لە سێبەری ئەو سیاسەتانەی بۆ ریشەکێش کردنی گەندەڵی و چاککردنی پێڕۆی ئیداری و هەڵوەشاندنیگرێبەستی نێوان دەسەلآت و پارەو رزگاربوون لە یارمەتی رێپێنەدراو بۆ پالێوراوانی پارتی فەرمانڕەوا لە هەڵبژاردندا دانرابوو. ئەم بوێریەش کاتێ دەرکەوت کۆمپانیا سەنعەتیە گەورەکان، وەکو «گۆڵدستار» رایانگەیاند، کە یارمەتی زیاتری حزبە نەیارەکان دەدەن بەرانبەر



هاندانی کەرتی تایبەت بەبەرەوپێشچوون لە پرۆسەی تایبەتکردندا کە بەرهەڵستکاریەکی توندی رووبەڕووبووەوە لەلایەن سەندیکا کرێکارییەکانەوە.

سەندیکا کرێکارییەکان و یەکێتیە پیشەییەکان بەگومانەوە تەماشای هەڵسوکەوتە ناڕەواکانی کۆمپانیا تایبەتییەکان دەکەن کە هی هەندێ خێزانی کۆرین و سەرۆکەکەی کە خاوەنیشێتی بەرێوەی دەبا، چونکە بەرای ئەوان رکابەرییەکی ناشەریف و نابەرانبەرە لەتەك کۆمپانیا گشتییەکاندا و لەبەر بێدادی لە بەشینەوەی ساماندا خاوەنی پرۆژە بچووك و ناوەندییەکان واهەستدەکەن تووشی تالآنیەکی رێکخراو دەبن لەلایەن کۆمپانیا گەورەکانەوە، کە کرێکاران بێبەش دەکەن لەو مافە سروشتیانەی لە یاسای کاردایە.

پارتە رامیارییەکانی کۆریاش لە شلەژانێکی دامەزراوەییدان، ئەوان گرێبەستن بە کەسێتی دیاریکراو نەك بە سیاسەت و ئایدیۆلۆجیاوە، هەروەها پارە حوکمی هەڵبژاردنی سەرکردەی حزبەکان و پالێوراوانی شوێنە حکومییەکان دەکات نەك لێزانی.

## زانیاریکاری و گەندەڵی

گەورە فەرمانبەرانی کۆریای باشور زانیاری دەفرۆشنە کۆمپانیاکان، واتە وەکو هۆیەکی ناڕەوا بۆ کۆکردنەوەی پارە بەکاریدەهێنن بەتایبەت ئەو زانیاریانەی پەیوەستن بە کەمکردنەوەو بەلێندانەوە، بۆیە «کیم یونگ سام» لە ساڵی (١٩٩٣) هەندێ رێکگری دانا فەرمانبەرانی خزمەتی مەدەنی و رامیاریکارانی پابەند کرد بە ئاشکراکردنی سامانەکانیان، دوای ئەوەش دەرکەوت نزیکەی (٨٤٪)ی دارایی نەگوازرایەوە و (١٥,٣٪) ی دارایی گوازرایەوە لە شێوەی سپاردەی بانکی و دارایی لێشاو بەستوو، ئەوجا بۆ خەڵك دەرکەوت کە سەرەڕای کەمی موچەی

فەرمانبەرانی دەوڵەت ئەوە زۆربەیان بەگەندەڵکاری سامانی زۆریان پێکەوە ناوە، کەمینەیەکیشیان تووشی سزا هاتن لە کاتێکدا زۆرینەیان ڕزگاریان بوو.

گەندەڵکاری بەوەکارهێنانی هەندێ فەرمانبەر بۆ دەسەڵاتەکانیان لە لیجنە هەمیشەییەکانی کۆمەڵەی نیشتمانیدا دەکرێ وەکو لیجنەی پارەدارکردن، بازرگانی، پیشەسازی بنیاتنان و ئاوەدانکردنەوە...هتد. ئەندامانی ئەم لیجنانە بەبەرتیل زانیارییەکانیان دەدەنە گەورە پیاوانی کار.

## پارە و هەڵبژاردن

پاڵێوراوانی پارتەکان پارەیەکی زۆر لە هەڵمەتی هەڵبژاردندا خەرج دەکەن بۆ کڕینی ویژدان تا دەنگەکان بۆ خۆیان بێ نەك بۆ حزبە نەیارەکان. ئەمەش مانای وایە هەڵبژاردن هۆیەکە بۆ بەردەوام بوونی بژاردە فەرمانڕەواکان نەك ئامرازێکی دەربڕین لە هاوتابییە ڕامیارییەکان لە کۆمەڵگەدا، بەڵکو وەکو هۆیەك بەکار دێ بۆ دابڕینی ڕەوایەتی بەسەر ڕژێمی فەرمانڕەوادا.

لەتەك ئەو گۆڕینە دیمۆکراتیانەی بەسەر کۆریادا هاتن لە دوادوایی ساڵی ١٩٨٧ پەیوەندی پارەو دەسەڵات تووشی هەڵوەشاندن هات و هاوپەیمانییە ئابوورییەکان داوای ئازادبوونیان لە دەسەڵات دەکرد، بەڵکو دوورتریش ڕۆیشتن و داوای بەرەنگاربوونەوەی دەسەڵاتی دەوڵەتیان دەکرد. ئەوجا «چینگ» دامەزرێنەری کۆمەڵەی «هیوندای» خۆی پاڵاوت بۆ پۆستی سەرۆك، گەلی کۆریاش ترسیان لێنیشت لە دەستوەردانی کۆمپانیا گەورەکان لە پرۆسەی ڕامیاریدا، هەروەها تێکدانی، بە کڕینی دەنگەکان و تێکدانی هەڵبژاردنەکان، دواتریش زیان گەیاندن لە تەواوی پرۆسە دیمۆکراتییەکە.



بۆ نەهێشتنی ئەو سەرپێچیانەش لە هەڵبژاردنەکاندا دەکرێ، پارتە نەیارەکان کۆنگرەیەکی هاوبەشیان کرد لە نیسانی ١٩٩٦دا، ئەندامانی کۆنگرەش «یادداشتی سپییان» دانا لەبارەی هەڵمەتی هەڵبژاردنی نایاساییەوە کە ئەگەر وابڕوا ئەوا پارتە نەیارەکانی کۆریای باشور لە هەر هەڵبژاردنێکدا دەدۆڕێنن [٣٩].

ئەم ڕووداوانەی کۆریاش لە جۆری گەندەڵی سیاسی وێنەیان هەیە لە تایوان کە چوار سەدەیە ئەزموونی هەڵبژاردنی هەیە، لە ناوەڕاستی حەفتاکانیشەوە ڕامیاریکارانی دەرەوەی پارتی فەرمانڕەوا چالاکیە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی بەرهەڵستکاری سیاسەتەکانی حزبی فەرمانڕەوایان کۆکردەوە، ڕۆژنامەو چاپەمەنییان دەردەکرد کە گەندەڵی حوکمەتی تاوانبار دەکرد، ئەمەش پەیوەندی حزبی فەرمانڕەوای بە کەرتی تایبەتیەوە لاوازکرد، سەرەڕای ئەوەش حزبی فەرمانڕەوا هانای بۆ کەرتی تایبەت برد بۆ یارمەتی هەڵمەتی هەڵبژاردن لە سەر زەمینەی یەکێتی بەرژەوەندی لە نێوان پارتی فەرمانڕەوا و گەورە پیاوانی کار بۆ ئەوەی ڕیکخراوە کرێکارییەکان و یەکێتیە پیشەییەکان بەشدار نەبن لە داڕشتنەوەی سیاسەتە ئابووریەکاندا. ئەمەو لە تایواندا دوو شێوازی کڕینی دەنگەکان هەیە: یەکەمیان، پێشکەشکردنی دیاریە وەکو «سەعات، قەڵەم، چەرخ.....هتد» یان پارە لە پاڵێوراوەوە بۆ دەنگدەر، دەنگدەریش، بەتایبەت لە ئاواییەکاندا وا تەماشای ئەو دیاریە دەکات کە بۆ پتەوکردنی پەیوەندییەکانیانە نەك بۆ دەنگ کڕین. دووەمیان، کڕین و فرۆشتنی دەنگەکان، واتە پاڵێوراو لەو ناوچانەدا کە گومانی پشتگیری لێدەکات، بەپارە دەنگ دەکڕێ، بەڵام لە ڕووی دەسپێکەوە ئەگەر بۆ دیاری بێ، یان بۆ بازرگانی، ئەوە هەردووکیان نایاساین و بەلاقرتێشەوە تەماشا دەکرێ، هەندێکیش وادەبینن کە پرۆسەی کڕین و فرۆشتنی دەنگەکان بەشێکە لە پرۆسەی سوود گۆڕینەوە.

بەم شێوەش ئەو گەندەڵییەی لە کۆمەڵگەی تایوانیدا بڵاوبوو ئەنجامی پێشبڕکێی کۆکردنەوەی سامانە لە سێبەری هەلومەرجێکدا کە دیموکراتی تێدا نەبوو ژیانی ڕامیاریش بەدەستی تەنیا یەك حزبە و نەشیتوانیوە هێمنی و ئاسایش لەو وڵاتدا دابین بکات. بۆیە خەڵك ناچار بوون ساڵی ١٩٩٧ خۆیان پیشان بدەن و داوای حکومەتێ بکەن بتوانێ لەتەك ئاریشەکانی کۆمەڵگەدا هەڵسوکەوت بکا هەروەها دەسەڵاتی تەشریعی پاك و سەربەخۆ بێ سەرباری داواکردنی نەهێشتنی دیمەنەکانی گەندەڵی.

## بەگژاچوونی گەندەڵی

هەندێ لە شارەزایان وای بۆچوون کە ئاسانترین ڕێگە بۆ نەهێشتنی گەندەڵی دانانی بنەمایەلێکی وردوتیژە، بەڵام بنەمای تیژ لەوەیە زەمینەیەکی بەپیت بێ بۆ هەندێ فەرمانبەری حکومی تا گەندەڵکاری زیاتر بکەن، «فیتۆ ناتری» ئێژێ ئەگەر بنەماکان زیاد لە پێویست تیژ بوون ئەوە لەوەیە ببێتە ڕێگر لە بەردەم بەڕێوەچوونی ئاسایی چالاکییە ئابوورییەکان یان هەر دامەزراوەیەك.

خەڵك هەیە لە دیموکراتی و ئازادی ڕۆژنامەییدا پەناگەیەك دەبیننەوە بۆ ڕزگارکردنی هەر وڵاتێ لە ئاریشەی گەندەڵی، هەر بۆ زانین بەگژاچوونی گەندەڵی وا پێویست دەکات کە مەوداکەی گەندەڵکارانی لوتکە تێپەڕێنێ، ئەزموونەکانیش دەریان خستووە کە هەڵبژاردنی ئازاد و چاکسازیی ئابووری و ئیداری چارەی وڵات ناکات لە پەتای گەندەڵی ئەگەرچی سنووری بۆ دادەنێ، چونکە لە هەر دوو کەرتی گشتی و تایبەتیدا بڵاوە و هەردوو لا بەدەست بەرتیل و ناچارکردن و فێڵ و خراپ بەکارهێنانی دەسەڵات و لێسەندنی کرێی کرێکاران و شتی دیکەی لەو جۆرەوە دەناڵێنن.

دەوڵەتانیش لە هەر جۆرە ڕژێمێکی ڕامیاریدا بەگژاچوونی گەندەڵی دەکەنە ئامانجی سەرەکییان، وەلێ نووسینە ئابووری و ڕامیارییەکان چارەسەرێکی



تەواومان پێشکەش ناکەن بۆ ڕیشەکێشکردنی گەندەڵی، بەڵکو کۆمەڵناسیی ڕۆژئاوایی پاکانەی گەندەڵی دەکات لەڕووی ئەوەی ڕۆڵی وەزیفی وەجێدەهێنێ، لەتەك ئەوەشدا هەیە کە بەرنامەیەکی تەواوی بۆ نەهێشتنی گەندەڵی داناوە و لەمانەدا دەردەکەوێ:

- پێشخستنی بنەمای زانیاریکاری دامەزراوەکە.
- پێشخستنی بنەماکانی دروستکردنی بڕیار.
- ئیشکردن بەرێسایەکی تەواو لە هاندەری مادی و مەعنەوی.

بەڕای «ڕۆبرت کینگارۆ» بەگژاچوونی گەندەڵی لەمانەوە دەستپێدەکات [٤٠]:

١- شیکردنەوەی بونیادی دامەزراوەکە بۆ هەڵسەنگاندنی ئاستی وەجێگەیاندن و زانینی ئەوەی لە کوێ و چۆن گەندەڵی ڕوودەدات و قەبارەکەی چەندە، ئەزموونیش دەریخستووە کە هەر دامەزراوەیەك زیاتر تووشی گەندەڵی دەبێ کاتێ بەرپرسەکەی لەباری قۆرخکردندابێ بەرانبەر مەعمیلەکان و کاتی دەسەڵاتی فراوانی دەبێ ئازادی هەڵسوکەوتی پێدەدات و ئەویش کارێلێ دەکات بواری چاودێری تێدا نییە. بۆیە واپێویست دەکات دەسەڵاتی بەرپرس دیاری بکرێ وەکو یەکەم هەنگاو لەڕێی ڕیشەکێشکردنی گەندەڵی.

٢- هەڵسەنگاندنی تێچوەکانی گەندەڵی و سوودەکانی (ئەگەر هەبێ) هەروەها نیشانکردنی وێنەکانی گەندەڵی لە گشت چالاکییەکاندا.

٣- هەڵسەنگاندنی گشت میکانیزمە بەکارهێنراوەکان لە ناسینی فەرمانبەرو هاوڵاتیە بۆگەنەکان.

بەڕای «ڕۆبەرت دال» چارەکردنی گەندەڵی لەوانەوە دەستپێدەکا کە بەئاسانی ڕیشەکێش دەکرێن و تێچوەکەشی کەمەو ئامانجی ڕامیاری لەدوایەو کاریگەریشی

لە شەش مانگدا دەرەکەوێ، ئەگەرچی ئەو هەنگاوانە دژی شێوە ترسناکەکانی گەندەڵیش نەبێ. دیارە نابێ تێچوی بەگژاچوونی گەندەڵی لە سوودەکانی زیاتر بێ، چونکە سوککردنەوەی ئاستی گەندەڵی خوازراوە نەك داگرتنی تا ئاستی سفر، ئەو جۆرە هەولانەش رەنگە ئەنجامی پێچەوانەی هەبێ. لەبارەی ئاشکراکردنی وێنەکانی گەندەڵیش ئەوە ئاسانە بەوەکارهێنانی میکانیزمی پیشکەوتوو هەروەها بە هەردوو سەرەتای لێپرسینەوەو بینراوەیی کە نایەڵن هاوپەیمانی گەندەڵکاران درێژە بکێشێ.

لەسەر دەوڵەتیش پێویستە کە لە بیرۆکراتییەتی ئەو هێزەی فەرمانبەر کەم بکاتەوە کە بەکاریدەهێنێ بۆ وەرگرتنی شت لەبەرانبەر ئەو مۆڵەت و قەرزانەی بەلایەنەکەی تریان دەدات، رێگەی کەلەپچەکردنی قۆرخکردنی دەسەڵاتی بەرپرسی حکومی لە نووسینگە گشتییەکانی سکاڵاوە دێت. سەرباری بەرزکردنەوەی ئاستی بینراوەیی یاساکان و پێرۆ کارپێکراوەکان و توندکردنی چاودێری لەسەر هەڵسوکەوتە چەوتەکانی هەندێ فەرمانبەر. بەڵام ئایە دەتوانرێت لە کۆمەڵگە کلاسیکییەکاندا ئەم هەنگاوانە بنرێن؟

ئەزموونی چەندین ولاتی گەشەسەندوو کە ئەم هەنگاوانەیان ناوە بۆ بەگژاچوونی خۆدزینەوە لە باج و بەرتیل و ناسیاری، نەکاریان دەرخستووە لە وەدیهێنانی ئامانجەکان لە رادە دانان بۆ گەندەڵی کارگێڕی و رامیاری، دیارە ئەم هەنگاوانە هاورێ بوون لەتەك هەرایە راگەیاندن لە مەودای کورتدا، لەمەودای درێژیشدا ئەنجامیان نەبوو، هەرچۆنیش بێ نابێ پاکانە بۆ گەندەڵکاری فەرمانبەران بێنینەوە لەبەر کەمی موچەیان یان لەبەر پتەوی پەیوەندی کۆمەڵایەتی، چونکە هەردوو مەسەلەکە چارەدەکرێن بەباشکردنی موچەی فەرمانبەرو گواستنەوەی زۆرەملێی فەرمانبەران بۆ ژینگەیەك کە نەناسراو بن تێیداو توانای پەیوەندی بەستن نەبێ لە نێوان بیرۆکراتییەکان و هاولاتیاندا.



چارەسەری سندوقی دراوی دەوڵەتی و بانکی دەوڵەتیش بۆ بەگژاچوونی گەندەڵی ئاوایە[٤١]:

- راستکردنەوەی پەیکەری لە بونیادی ئابووریدا کە بتوانێ گەندەڵی رەسمی سوکبکاتەوە.
- فراوانکردنی کەرتی تایبەت و زیاتر سەربەخۆکردنی.
- دانانی پێرۆیەکی باشتر بۆ هاندەرەکان بەگرێدانی کرێ و موچە بەبازاڕەوە.
- هەڵوەشاندنی کەرتی گشتی و رۆیشتن لە تایبەتکردندا.
- سوککردنەوەی ناوەندێتی لە ئیدارەی حکومیدا.

بەرای سندوقەکەو بانکەکەش ئەم هەڵسوڕانانە دەستی دەوڵەت کەلەپچە دەکەن و دواتریش گەندەڵی رەسمی سوك دەکەنەوە، بەڵام وادیارە ئەم چارەسەرانە بە کەڵکی ئەو دەوڵەتانە نەهات کە وەریانگرت، بەڵکو پێچەوانەکەی روویداو تێکڕاکانی گەندەڵی رەسمی و نارەسمی زیادیکرد لە قۆناغی جێبەجێکردنی چاکسازیە ئابووریە پەیکەرییەکان یان تەنانەت لە قۆناغی «کرانەوەی ئابووری» و گواستنەوە بۆ ئابووری بازاڕیش. ئەو قەڵەبالغیە راگەیاندنیەی کۆریای باشور بەخۆیەوە بینی لە ماوەی هەڵگێرانەوە، ئایا سەبارەت بە روودانی شۆڕشی سەنعەتی و ریشەکێشکردنی گەندەڵی کە «پارك» رایگەیاند ئامانجەکانی وەدینەهێنا؟ «پارك» لەمبارەوە وتی «ئەوانەی نۆینەری بەرژەوەندی گەل بوون لە کۆمەڵێ بازرگان لە بازاڕی رامیاری بەولاوە چیدیکە نەبوون و جیاوکی زۆریان هەبوو، تەنیا نۆینەری بەرژەوەندییە تایبەتییەکانیان بوون». بۆیە «پارك» هەڵگێڕانەوە سەربازییەکەی بە هەولێ بۆ رزگارکردنی گەل ناودەبرد و وەکو پرۆسەیەکی نەشتەرگەری بوو بۆ لەشی پڕبرینی کۆریا بە برینەکانی گەندەڵی و جیاوکەکان و بێ وەلائی، خۆشی

بەنەشتەرگەرێ ناودەبرد کە پرۆسەیەکی بەپەلەی پێسپێردراوە بۆ چارەکردنی گەل لە نەخۆشییەکەی.

لە راستیشدا «پارك» لە هەفتەی یەکەمی هەڵگێڕانەوەکەیدا چوار هەزار کەسی دەسگیر کردو ٤١ فەرمانبەری خزمەتی مەدەنی دەرکرد لەوانەی گومانی کۆکردنەوەی سامانی نارەوا و دەستێکەڵکردن لەتەك پیاوانی حوکمی پێشوویان لێدەکرا، هەروەها ٥١ بەرێوەبەری کۆمپانیاش بەهۆی گەندەڵییەوە دەسگیرکران، هەڵمەتێکیشی بەرپاکرد دژی ئەو هەڵسوکەوتانەی دژی ئەخلاقی کۆمەڵایەتین، بەڵام هەڵمەتەکەی «پارك» دژی گەندەڵی درێژەی نەکێشا و گیراوەکان دوای ئەوەی پشتگیری و وەلای خۆیان بۆ «پارك» راگەیاندو دوای ئەوەی پارەی باشیان پێدا بۆ جێگیرکردنی دەسەڵاتە رامیارییەکەی، بەردران. هەندێکیان پارەیان بەخشی و لە سندوقێکی حکومیدا کۆکرایەوە، هەندێ دیکەیان یامەرتیان دا بە یەکێتی پیاوانی کار، سەرباری پابەندبوونی هەندێکی دیکەیان بەجێبەجێکردنی پرۆژەگەلێ کە حکومەت دیاری دەکات. بەم رێگەش حکومەت قاپی لەسەر پشت کردەوە بۆ کاسبی رێپێدراو بۆ پیاوانی کار، ئەوانەی لێکۆڵینەوە یاساییەکان تانەی کۆکردنەوەی سامانی نارەوای لێدان. لەتەك ئەوەشدا گەندەڵی بەردەوام بوو لە داخۆرینی لەشی نەتەوەی کۆریا، بۆ ئەوەش کۆریا رزگاری بێ لەم پەتایە دەبێ سەر بکەوێتە سەرخۆیدا بە پاککردنەوەی ژینگەی کۆری لە خراپە کۆمەڵایەتییەکان و چەسپاندنی رێسایەك لە بەهای ئەخلاقی و هوشی کۆیی پابەند بە پیرۆزی یاساو رێزگرتنی پێرۆی گشتی. «کیم یونگ سام» لە کانونی دووەمی ١٩٩٦ لە بەردەم کۆمەڵەی نیشتمانی حەزی خۆی پیشاندا لە دروستکردنی کۆمەڵگەیەکی دادوەر، هەموو ستەم و بێدادی و ئەخلاقە نارێکەکانی تێدا نەمێنی، بەپابەند بوون بە راستوێژی و دادوەری و هەبوونی باوەر لە گشت کەرتەکانی چالاکی رامیاری و ئابووریدا، بەچاوپۆشین لە سەرپێچییەکانی خزم و راوێژکارە نزیکەکانی «کیم» ئەوە



ئەو هەندێ سیاسەتی بەکاری جێبەجێکرد بۆ بەرنگاربوونەوەی گەندەڵی لەوانەش کۆمەڵێ هەڵسوڕان وەکو دەرکردنی یاسای تایبەت بە هەڵمەتی هەڵبژاردن تا بوار بدا بە رکابەری جوامێرانە بە سیاسەتەکانیان نەك بەکەسێتی پالێوراوەکان و توانای خەرجکردنیان، بەو شێوەش «کیم» توانی تاڕادەیەك جلەوی هەڵبژاردن لە دەست پارە دەربێنێ. حزبەکان لە کۆریادا لە سەرەوە بۆ خوارەوە ئیش دەکەن پێچەوانەی باو لە حزبە بڕواییەکاندا کە لە خوارەوە بۆ سەرەوە ئیش دەکەن، لە کۆریاشدا قەت سەیری حزب وەکو بازنەیەك لە نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگەی مەدەنی نەکراوە، یان وەکو پێشکەشکاری خزمەت بۆ دەنگدەرەکانی، بەڵکو تێڕوانینی بۆ حوکم ئامانجێکە و هیچی تر تەنیا رێگەش بۆی پارەیە، هەڵبژاردنی پالێوراوانیش دەوەستێتە سەر ئەو پارەی لە سەر هەڵبژاردن خەرجی دەکات، بەمەش بواری زیاتر بۆ بەرتیل و گەندەڵی دەرەخسێنێ. بۆ رێگرتن لەم دیاردەش دەستوری کۆریا بەشێکی تەواوی تێ ئاخێنراوە سەبارەت بە هەڵبژاردنی سەرۆك و ئەندامانی پەرلەمان، لیجنەیەکی ناوەندیش پێکهێنرا بۆ بەرێوەبردنی هەڵبژاردن و چەند لیجنەیەکیش بۆ بەدواداچوونی پاکی هەڵبژاردن و هەڵمەتەکانی و قەدەغەکردنی زیادەڕوویی لە پارەدارکردنی رامیاری بۆ حزبەکان و دڵنیابوون لە خەرجکردنی ئەو پارانە بۆ ئەوەی بۆی دانراوە، بەمەرجێ ئەو لیجنانە خۆیان لە کاری رامیاریدا ئیش نەکەن.

### یاسا لە رووی گەندەڵیدا

دەرکردنی کومەڵێ یاسای پەیوەست بەبارمەتیدان و رێکخستنی هەڵمەتەکانی هەڵبژاردنی پارتە رامیارییەکان لە ئازاری ١٩٩٩ بەیەکەم هەنگاو دادەنرێ بۆ هەڵبژاردنی ئازاد کە هەڵسوکەوتی راست بۆ دیمۆکراتی لە کۆریای باشوردا پتەو بکات، یاسای پارەپێدانی پارتە رامیارییەکانیش بۆشاییەکی رکابەری لەنێوان حزبەکاندا ئامادە دەکات بەپێی بنەماکانی گەمەی رامیاری پاك و کەمترین تێچو، بەئامانجی

وەدیهێنانی دادوەری لە بەشینەوەی ئەو پارانەی بۆ حزبەکان تەرخانکراون، سەرباری پاراستنی سەرچاوەکانی پارەپێدانی پارتە نەیارەکان، بۆ لە سنووردانی پارەپێدانی نارەوای پارتەکان و لاوازکردنی گرێبەستی نێوان دەسەڵات و پارە. پێش دەرچوونی ئەم یاسایەش زۆربەی پارە و یارمەتییە داراییەکان لە بەشی پارتی فەرمانڕەوا بوو، لە کاتێکدا پارتە نەیارەکان بێبەشکرابوون لەو یارمەتیانەی بەشی هەڵمەتی هەڵبژاردن بکات.

هەنگاوی دووەمیش دەرکردنی یاسای هەڵبژاردن بوو کە ئەوپەری خەرجی لەسەر هەڵمەتەکان دیاریکرد بەنیوەی ئەوەی لە یاسا کۆنەکاندا بوو، برەکەش ٦٥ هەزار دولارە کە پاڵێوراو بۆی هەیە خەرجی بکا لە هەڵمەتی ئەندامبوون لە کۆمەڵەی نیشتمانی. هەڵبژاردنەکەش هەڵدەوەشێتەوە بۆ ئەو کەسەی خەرجییەکەی بە (١٠٠–٢٠٠) دولار لەو برە پارە پتربێ هەروەها یاسا تازەکە سزای توندی سەپاندە سەر ئەو کەسانەی بەخشینی نارەوا پێشکەش دەکەن و ئەوانەش وەریدەگرن، بە دەرکردنی ئەم یاسایەش سنوورێ دانرا بۆ بەگەڕخستنی پارە لە خزمەتی رامیاریکاریدا.

هەنگاوی سێیەمیش، دەرکردنی یاسای قەدەغەکردنی پێشێلکارییە هەڵبژاردنییەکان بوو لە ساڵی ١٩٩٧ بەپێی ئەم یاسایەش هاوپەیمانی رامیاری لە دەرەوەی حزبەکان قەدەغەکرا، ئەمەش تێچوی هەڵمەتەکانی کەمکردەوە و بواری بە پاڵێوراوە سەربەخووەکاندا کە لە سەر شاشەی تەلەفزیون خۆیان بناسێنن.

سەرباری قەدەغەکردنی بەشینەوەی نامیلکەی ناساندن، پرۆسەی ناساندنی پاڵێوراویش ئیشی لیجنەی بەڕێوەبردنی هەڵبژاردنە، بەم رێگەش سنوور دانرا بۆ هەڵسوکەوتی نارەوا وەك کڕینی ویژدان و گەندەڵکاری رامیاری.



## هەڵوەشاندنەوەی پەیوەندی نێوان دارایی و رامیاری

گرێبەستی نیوان پارە و رامیاری لە چەندین دەوڵەتی ئاسیاییدا شتی باشی بۆ پیاوانی کار دابینکرد بوو وەك قەرزو مۆڵەت و لێخۆشبوون لە باج... هتد.

ئەوجار دەنگی پارتە نەیارەکان بەرزەوەبوو لە داواکردنی رادەدانان بۆ دەسەڵاتی پارەداران بەسەر رامیاریکارانەوە بەو لەخشتەبردنانەی پێشکەشیانی دەکەن و، هەروەها هەڵوەشانی هاوپەیمانی ناپیرۆزی نێوان دەسەڵات و پارە بە رێکخستن و رێکگرتنی پێرۆی دارایی هەتا دەرامەتە داراییەکان دانەچۆڕێن بەرەو کۆمپانیا گەورەکان، کە بە هەڵسوکەوتە نارەواکانیان بوونەتە تەگەرە لە رێی کۆمپانیا بچووك و ناوەندییەکان.

لەم بارەشەوە هەنگاوە بوێرە پێشتر روونەداوەکەی کیم یونگ سام لە شوباتی ١٩٩٣ شایانی ئاماژە پێکردنە کاتێ سەرچاوەی سامانی خۆی و خێزانەکەی راگەیاند و ئەندامانی وەزارەتەکەی و ئەندامانی کۆمەڵەی نیشتمانی و گەورە فەرمانبەرانی حکومەت شوێن پێیان هەڵگرت، ئەم هەنگاوەش بەهەنگاوێتر پتەو کراو ئەویش بەکارهێنانی ناوی سیانی راستەقینە بوو لە گشت مامەڵە داراییەکاندا. سەربارەی دەرکردنی یاسای ئەخلاقەکانی خزمەتی گشتی، ئامانجی ئەم هەڵسوڕانەش خولقاندنی کەشێکی رامیاری پاك بوو لە گەندەڵی و بەرتیل، سەرباری هەڵوەشانی گرێبەستی دەسەڵاتی پارە و دەسەڵاتی رامیاری کە لە ئەنجامدا دەرژێتە خانەی خزمەتی بەرژەوەندی تایبەتیەوە دوور لە بەرژەوەندی گشتی.

ماوەی حوکمی کیم یونگ سام پرۆسەیەکی پاککردنەوەی فراوانی بینی کە هاورێ بوو لەتەك دەست لەکارکێشانەوە و لادانی هەندێ لە ئەندامانی پارتی فەرمانڕەوا و حکومەتیش، ئەوانەی سامانی رێپێنەدراویان لەلا کوبووەوە، ژمارەی ئەوانەی لەکارخران ٧٣٩ فەرمانبەر بوو، هەروەها لادانی ١٣٦٣ فەرمانبەری دیکە و دادگەیی کردنی ژمارەیەکی بەرچاو لە گەورە فەرمانبەران.

سەیریش لەو سەرسورمانە بوو کە تووشی گەلی کۆری هات لە دوای راگەیاندنی گەورەبەرپرسان بۆ سامانەکانیان کە فرە زۆر بوو بەرێگەی ناڕەواش وەدەستیان هێنابوو، بۆیە بڕوایەك لای خەڵك دروستبوو، ئەویش ئەوە بوو کە بژاردەی رامیاری لە کۆریا بژاردەیەکی نائەخلاقیە.

سیاسەتی «کیم دای یونگ»یش درێژەپێدانی پێشووی بوو لە بەگژاچوونی گەندەڵیدا، لەکاتی هەڵمەتەکەیدا داوای جیاکردنەوەی ئیدارەی کرد لە موڵکایەتی، حوکمەتەکەی خۆشی پابەند کرد بە دووبارە پەیکەربەندکردنی تۆڕی بانکی و دانانی سنووریٚ بۆ فراوانبوونی گەندەڵی بە هەڵوەشانی پەیوەندی نێوان حکومەت و پیاوانی کارو دووپاتکردنەوەی زیاتری بینراوەیی کە ئیشپێکردنی نەیهێشت حکومەت لەتەك کۆمپانیا زەبەلاحەکاندا مامەڵە بکات، کاتێکیش کۆمەڵەی «هانبو» کەوتە سەر ساج عەلی حکومەت هیچ یارمەتی نەدا، پارەدەرو وەبەرهێنە بیانییەکان وایانزانی مەسەلەکە پیوەستە بە گەندەڵی رامیاریەوە، بەڵام وێنەکە روونتر بووەوە کاتیٚ حکومەت دەسبەرداری «کیاموتورز» بوو کە بەهۆی پسپۆری و لێزانیەوە وێنەیەکی پرشنگداری هەبوو لای کۆرییەکان. ئەوجار پرسیاری زۆر خرانە روو سەبارەت بە هەڵوێستی حکومەت لەو مەسەلە، بەتایبەتی ئەو رووداوە هەڵوێستەکەی ترسناکتر کردو زۆر کۆمپانیای بەرەو کەوتنە سەر ساج عەلی نارد.



## دیمۆکراتی لە بەرانبەر گەندەڵیدا

ئەو چاکسازییە ئابووری و ئیداریانەی مۆرکی دیمۆکراتییان هەڵگرت بوو لە ماوەی «کیم یونگ سام»دا لەم سێ تەوەرەدا چەقیان بەستبوو(٤٢):

**یەکەم** : پێکهێنانی حکومەتێکی تازە و نەهێشتنی گەندەڵی.

**دووەم** : پەیڕەوکردنی پێڕۆیەکی دارایی ورد بۆ هەڵوەشانی پەیوەندی نێوان دەسەڵات و پارە.

**سێیەم** : دڵنیا بوون لە باش بەرێوەچونی پرۆسەی رامیاری لە وڵاتدا.

بۆ وەدیهێنانی ئەم ئامانجانەش حکومەتی «کیم یونگ سام» ئەم هەڵسوڕانانەی ئەنجامدا:

- راستکردنەوەی دەستور و پێشخستنی یاساکان بو تەواوکردنی چوارچێوەی یاسایی پێرۆکە بە شێوەیەك دەسەڵات پابەند بکا بەرێزگرتن و جێبەجێکردنی یاسا.
- پاراستنی مافەکان و ئازادیە بنچینەییەکان وەکو ئازادی رۆژنامەیی و خڕبوونەوە و رێزگرتنی کەرامەتی مرۆڤ و مافی کرێکاران لە مانگرتندا و حەپس نەکردن بەبیٚ حوکمی دادگە.
- سەربەخۆکردنی تەواوی دەسەڵاتی دادگەیی لە هەردوو دەسەڵاتەکەی دیکە، بە مەرجیٚ پیاوانی دادگە خاوەن ئەخلاقی پەسەند و رەوشتی باش و پاك بن و حوکمەکانیان بەگوێرەی تێڕوانینی خۆیان بیٚ کە دەبیٚ گونجاو بیٚ لەتەك رۆحی یاسادا.
- بەگەڕخستنی دەسەڵاتی یاسادانان و پتەوکردنی رۆڵی لە ژیانی وڵاتدا و لە چاودێریکردن و رووبەڕووبوونەوەی دەسەڵاتی جێبەجێکردندا بەگوێرەی دەستوری کۆریاش بڕیارەکانی سەرۆك پێویستیان بە دەنگی ٣/٢ ی ئەندامانی پەرلەمانە تا

جێبەجێ بکرێت، دەسەڵاتی تەشریعی دەشتوانی هەر وەزیرێ تەنانەت سەرۆك وەزیرانیش لەکاربخات.

بەڵام سەرەڕای ئەو دەسەڵاتانەی کە پەرلەمان هەیبوو ئەوە بەگژاچوونی گەندەڵی رامیاری پێویستی بە جۆرە هاوتایەك هەیە لەنێوان پەرلەمان و حکومەتدا، بەشێوەیەك چاودێری هەڵسوکەوتی حکومەت ئاسان بێ لەسەر پەرلەمان، لە رووی کردارەکیشەوە پەرلەمان شکستی هێنا لەبەر نەبوونی چاودێری نالشت لە نێوان ئەو و حکومەتدا وەکو مەرجێکی پێویست بۆ رێگرتن لە گەندەڵی.

- دانانی دامەزراوەگەلێك بۆ بەدواداچوونی هەڵسوکەوتە بیروکراتییەکان وەکو لیجنەی چاودێری و پێداچوونەوە بۆ رووبەڕووبوونەوەی گەندەڵی بە وردبینی حسابەکانی دەوڵەت و بۆدجەی خۆجێییەکان، سەرباری دانانی لیجنەیەکی سەربەخۆ بۆ بەگژاچوونی گەندەڵی کە وەکو دەزگەیەکی راوێژکاری وایە بۆ یارمەتیدانی لیجنەی «چاودێری و پێداچوونەوە»، کارەکەشی دۆزینەوەی هۆکانی خراپی ئیدارەو نیشانکردنی هەڵسوڕانە خۆپارێزەکانە بۆ پڕکردنەوەی ئەو تاقانەی لە یاسا باوەکاندا هەن و چاککردنی شپرزەیی لە دامەزراوە حکومییەکاندا بۆ لە سنووردانی گەندەڵی.

هەروەها لیجنەی «ئەخلاقەکانی فەرمانبەرە حکومیەکان» دانرا کە چاکەی دامەزراندنی دەگەڕێتەوە بۆ پێرۆی «پارك» ئیشەکەشی تۆمارکردنی سەرچاوەکانی (شتەکان) فەرمانبەرە حکومیەکان و ئەو گۆڕانانەی بەسەریاندا دێت و سزادانی فەرمانبەرانیش لە کاتی سەرپێچی نایاساییدا.

بەڵام سەرەڕای ئەو هەنگاوە زۆرو هەندێجار تیژانە، کۆریای باشور نەیتوانی ئاستی گەندەڵی دابەزێنێتە نزمترین ئاست، لەوانەیە هۆیەکەشی ستراتیجییەکانی بەگژاچوونی گەندەڵی بێ کە بە پەلەو کورتخایەن بوون. بۆیە زۆربەی هەڵسوڕانەکان حبری سەر کاغەز بوون، ئەوەشی جێبەجێکرا فەرمانبەرە بچووکە گەندەڵکارەکانی



گرتەوە، دوور لە گەورەبەرپرس و پیاوانی کار. رەنگیشە هۆی بەردەوام بوونی گەندەڵی لاوازی و نەکاریی چواچێوە دامەزراوەییەکان بێ سەرەڕای هەبوونی ویستی رامیاری بۆ بەگژاچوونی گەندەڵی. گەلی کۆریاش دامەزراوەی تایبەت بە وەگژاچوونی گەندەڵی تومەتبار دەکا بەسستی و نەتوانین لە وەجێگەیاندنی ئیشەکانیدا، بەڵکو خۆیانیش بە بەرجەستەکردنی «گەندەڵی هێز» تومەتبار دەکا. خەڵکیش هەیە سەرنەکەوتنی کۆریای باشور دەگەڕێنێتەوە بۆ گوێنەدانی بە باش کردنی مووچەی فەمانبەران، کە بەهۆیەکی سەرەکی دادەنرێت بۆ گەندەڵکاری، لەکاتێکدا سەنگافورە و هۆنگ کۆنگ تاڕادەیەك سەرنەکەوتن لەو بەگژاچوونەدا بەجێبەجێ کردنی رێسایەك لە هاندان وەکو باشکردنی کرێ و موچەی فەرمانبەران.

لە ئەزموونی تایوانیشدا دەرکەوت کە زۆریی دامەزراوەکانی رژێم (ئەنجومەنەکانی جێبەجێ کردن، یاسادانان، دادگەی، چاودێری و خزمەتی مەدەنی، سەرباری هەبوونی هەرێمی سەربەخۆ کە دەسەڵاتی دارایی و ئیداری فروانی هەیە) بوو بەهۆی زۆربونی ئاستەکانی گەندەڵی.

بەئامانجی رێگرتنیش لە گەندەڵی، تایوان پلانێکی لەخۆگرت لەسەر چاکسازی رامیاری وەستابوو بە:

١- دەرکردنی یاسایەك لە شوباتی (١٩٩٣) بۆ سزادانی ئەو کەسانەی بەرپرسن لە دادگەیی کردنە هەڕەمەکی و نایاساییەکان.

٢- پابەندکردنی دادوەرەکان بە وازهێنان لە حزبەکانیان بۆ دڵنیابوون لە سەربەخۆیی و بێلایەنی دادگە.

٣- لەکارخستنی حوکمە عورفییەکانی (١٩٩١) بۆ رێگرتن لە باڵادەستبوونی دامەزراوەی ئاسایش و سەربازی.

٤- بەکارخستنی ڕۆڵی دەسەڵاتی یاسادانان بەدەرکردنی یاسای تیژ سەبارەت بەحوکمی عورفی و ڕاگەیاندنی شەڕ و لێبووردنی گشتی و بڕیاردان لەسەر بودجەی گشتی دەوڵەت و ئەمەش دەسەڵاتی پەرلەمانی پتەوترکرد بەرانبەر حکومەت.

سەرەڕای ئەم هەڵسوڕانانە کەوا پیشان دەدەن بەس بن بۆ گەمارۆدانی گەندەڵی لە تایوان، کەچی ئاریشەی گەندەڵی تا ئەمڕۆ هەیە و بەردەوامە ئەگەرچی بە پلەیەکی ڕێژەیی کەمتر.

لەسەر ئەمەی ڕابورد سەرنەکەوتنی کۆریا و تایوان لە ڕیشەکێش کردنی گەندەڵی ئیداری و ڕامیاری مانای وانییە کە ئەو ئیشە لە کردن نایەت، کۆمەڵگەکانیش بەبێ هۆکاری بەگژاچوونی گەندەڵی نابن وەکو :

- لەخۆگرتنی پلانێکی پتەوی پشتبەستوو بە میکانیزمی پێشکەوتوو، گەندەڵی وەلابخات و نەیەڵێ گروپی حکومی دروستبێ بۆ بەرەنگاری هەوڵەکانی بەگژاچوونی گەندەڵی.

- دانانی دەزگایەکی سەربەخۆ بۆ بەگژاچوونی گەندەڵی کە جیا بێ لە دەزگاکانی دەوڵەت و دەسەڵاتی فراوانی هەبێ بۆ پاراستنی لە هەر پەستانێکی ڕامیاری.

- پتەوکردنی ویستی ڕامیاری بە ویستی جەماوەری بۆ بەگژاچوونی گەندەڵی، سەرباری ئامادەکردنی هۆیەکانی ڕاگەیاندن بۆ خولقاندنی هۆشێکی جەماوەری دژ بە گەندەڵی.

- گەشەپێدانی ئەخلاقی بۆ فەرمانبەرانی دەوڵەت بەچاندنی ڕێسایەکی بەهایی جۆش و خۆنەویستیان لا بوروژێنێ بۆ بەرزکردنەوەی ناوی نەتەوەو نیشتمان، چونکە گەندەڵی پەتایەکی ترسناکە و وڵات لاواز دەکات و توانا ئابووری و ڕامیارییەکانی



دەڕوخێنێت و هەلی تێکڕاکانی گەشەکردن کەمدەکاتەوە و نایەڵێ ئەنجامە بە ئامانجکراوەکان وەدیبهێنرێن.

ئا بەم شێوە ئەگەر دیاردەی گەندەڵی لە دەوڵەتێکدا بەردەوام بوو ئەوە تێکڕاکانی وەبەرهێنان و گەشەکردن کەمدەکەن و نایەڵی دەسهاتی نەوتەوەیی دادوەرانە ببەشرێتەوە و جێگیری و پاچینەی کۆمەلایەتی وەدیبێن، بۆیە بەگژاچوونی گەندەڵی ئەرکێکی نیشتمانییە و هاوشانی ویستی ڕامیاری و ویستی جەماوەری گەرەکە بۆ ڕزگار بوون لە شوێنەوارە ڕوخێنەرەکانی لە سەر کۆمەڵگە.

دەوڵەت هێزی لەو ڕوڵەوە وەردەگرێ کە لە ژیانی ئابووری و رامیاریدا دیگێڕێ، چەندیش ڕۆڵی فراوانتربێ هەندەش هێز و دەسەڵاتی فراوانتر دەبێتەوە، دەوڵەتیش بەگشتی پێش جیهانگیری ئەرکی زۆر بوو وەکو ڕێکخستنی پاشەکەوت و ئاراستەکردنی وەبەرهێنان و بەشینەوەی دەرامەت بە موڵکایەتیە راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆکەی، بۆیە چەندین دەوڵەتی گەشەسەندوو توانیان بنەمای مادی — تەکنیکی بنیات بنێن، کە خستیانیە سەر ڕێی ئازادبوونی ئابووری دوای ئەوەی بە تێکۆشانی بزاڤە رزگاریخوازە نیشتیمانییەکان توانیان سەربەخۆیی رامیاری وەرگرن. بەڵام ئەو دەسکەوتە سەنعەتی و کشتوکاڵیانەی لە سێبەری دەسوەردانی دەوڵەتدا وەدیهاتن لێنەزانی پێوە دیار بوو، بەتایبەتیش شمەکە سەنعەتیەکان، چونکە فرەباش نەبوون و گرانبایش بوون، بۆیە نەتوانرا ئاراستەی بازاڕە دەرەکییەکان بکرێت و تەنیا بازاڕی ناوخۆی پێ پڕ دەکرایەوە، دیارە بەرهەمی سەنعەتکاری لەسەر سیاسەتی پاراستنی سەنعەتی نیشتمانی تازە پێگەیشتوو وەستابوو کە گومرگی زۆریان دەخستە سەر شمەکی سەنعەتی هاوردە.

بەڵام هەر کە چەرخی جیهانگیری دەرکەوت وەزیفەی دەوڵەت وردە وردە کشایەوە لە چەندین دەوڵەتی گەشەسەندوو، کە لە قاپی ئابووری بازاڕیاندا وەکو دەوڵەتە عەرەبییەکان. قۆناغی گواستنەوەش بۆ ئابووری ئازاد هاوڕێبوو لەتەك بەرزبوونەوەی تێکڕاکانی گەندەڵی رامیاری و کارگێری بە پلەی جیاواز لە نێوان دەوڵەتە عەرەبییەکاندا.

بەگوێرەی ئاستی بەکاری دامەزراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی و ڕێکخراوە ناحکومیەکان کە دەتوانن وێنەکانی گەندەڵی وەك بەرتیل و ناچارکردن و فێڵبازی و دژی ئاشکرا بکەن. کە ئیللا بەلانی کەم دوو دیوی تێدا دەبێ، یەکێکیان فەرمانبەری حکومییە کە دەتوانێ بۆ ئەو دیوەکەی تر کە بەرتیلی دەخاتە پێش، ئیمزاکردنی گرێبەندی حکومی یان جیاوك بە لێخوشبوونی نیمچەیی یان تەواو لە



باجدان، یان کورتکردنەوەی ڕێگەی سەردانی نووسینگە حکومییە بیروکاتیەکان ...هتد، پێشکەش بکات.

هەر بۆ زانینیش بابەتییەتی کۆڵینەوە وایدادەنێ کە گشت ئەنجامەکانی گەندەڵی نەخرێنە سەر ئابووری بازاڕ، چونکە لەو دەوڵەتانەی کە هێشتا دەوڵەت ڕۆڵی گرنگ دەگێری لە ژیانی ئابووریدا، ئەوانیش بە پلەی جیاواز گەندەڵیان تێدا بلاوە، بەرزترینیان ئەوەیە کاتێ تاوانی ڕێکخراو باو دەبێت و مامەڵە نایاساییەکان دەپارێزێ، چونکە ئەوانەی تاوانی ڕێکخراو دەکەن هەر خۆیانن خزمەتە حکومیەکان بەکاردەبەن و قازیەکان و پولیس و فەرمانبەران و رامیاریکاران ...هتد لە خشتە دەبەن، ئەوانەی بە پرۆژەنامەی گەندەڵی بچووکەوە دەسپێدەکەن تادەگەنە پرۆژەنامەی گەورەی روخێنەر بۆ ئابووری وڵات.

لە دواچارەکی سەدەی بیستەمدا کۆماری میسری عەرەبی پاینا لە پەیرەوکردنی سیاسەتی کرانەوەی ئابووری و دواتر جێبەجێکردنی سیاسەتەکانی چاکسازی ئابووری و بەرنامەکانی جێگیر کردن و گونجاندنی پەیکەری، کە وڵاتی خستە سەر ڕێی ئابووری بازاڕ، وازیشی لە پلانرێژی ناوەندی و کەرتی گشتی هێناو بە ڕێی تایبەتکردندا رۆیشت، لە ئەنجامی ئەم گواستنەوە گورجەی بەسەر فەلسەفەی ئابووری میسریدا هات، گەندەڵی کە ڕێی بۆ خۆشکرا سەری دەرهێنا و چەندین شێوەی وەرگرت وەکو:

- دەستگرتن بەسەر زەوییەکانی موڵکی دەوڵەت و بازرگانی پێوەکردنی، ڕێژەی زەویە بە تالانچۆکانی دەوڵەتیش نزیکەی ٥٣,٥٪ موڵکی دەوڵەتە لە ئەسکەندەریە وەکو نموونەیەك، نرخەکەشی چوار ملیار جونەیهی میسری دەبێ.

- خەڵەتاندن و فێڵبازی، وەکو دەرکردنی چەك بەبێ رەسید، هاوردنی خواردەمەنی بۆگەن، خەلەتاندنی بانکەکان بۆ وەدەسهێنانی قەرزی ئاسان کە دانەوەی لە تواناد

نییە بە تەزویرکردنی پەڕە ڕەسمییەکان بە دەستێکەڵکردن لەتەك هەندێ فەرمانبەری بانکە حکومییەکان ئەوانەی لە پێڕۆی بانکی دەرچونە.

- وەبەرهێنان لە دەوڵەتەوە کە سامانی زۆری تێدایە بۆ هەر کەسێ بیباتەوە وەکو هێڵی تەلەفۆن.
- خۆدزینەوە لە باج، ڕفاندنی شتی قەدەغە وەکو سڕکەر و شتی تر.
- بەرتیل کە گەورە بەرپرس و پیاوانی کار دەیسەپێننە سەر کۆمپانیا بچووك و ناوەندییەکان.
- یاری کردن بە نرخی پارە گۆڕینەوەو بازرگانی ناڕەوا بە پارە و ڕفاندنی پارە بۆ دەرەوە.
- پارە کۆکەرەوەکان و ئەو تێکەڵییەی کە لەم چالاکییەدا ڕوودەدات لە سێبەری نەبوونی بنەماکانی لێپرسینەوە.

کێشەی «ئالڕەییان» یەك لە نیشانە دیارەکانی مێژووی گەندەڵیە لە میسردا، لەبەر ئەو هەرایەی کە نایەوە لە ناوەندەکانی کۆمەڵگەی میسریدا کاتێ کۆمپانیای ڕەییان بۆ مامەڵەی دارایی پارە پێڕەواکانی نەگەڕاندەوە بۆ خاوەنەکانی، سەرباری سپاردنی پارەکانی لە دەرەوە بەبێ ڕازیبوونی وەزیری ئابووری میسر. هەروەها شاردنەوەی شوێنی کۆمپانیاکە لە دەزگای بازاڕی پارەی میسری، ئەم کۆمپانیایە بە درۆ پەیمانی قازانجی زۆری دابوو بەوانەی پارەیان پێ دەسپێرن، گرێبەندی وەهمییان پێدابوون بە سوویەکی مانگانە، ئەوجا کۆمپانیاکە بڕیاریدا ئەو سووانەی وەریانگرتوە لە پارە سپێردراوەکە دەری بێنێت کە نزیکەی (٨) ملیار جونەیهی میسری بوو.



شایانی باسە ڤایرۆسی پارە کۆکەرەوەکان لە میسرەوە گەیشتە سووریا و، لەوێشدا (کلاس و باشیان) هەمان فێڵیان بەکارهێنا، ئەمەش وادەگەیەنێ کە بازنەکانی گەندەڵی یەکتر تەواودەکەن و دژبەیەك ناوەستن لە ژێر ئالآی «ئەی نیشتمانی گەندەڵکارانی عەرەبی یەکگرن».

- ناڕەوا بەکارهێنانی دەسەڵات وەکو ناوزڕانی «ئەلحباك» لە ساڵی (١٩٩٦)، ئەمیش کەسێکی زیرەکە لە شاردنەوەی ڕاستی خۆیدا وەکو سیخوڕ یان درۆزن، «عەبدولوەهاب محەمەد ئەحمەد ئەلحباك» بوو بە هێمای هەموو فێڵبازێ کە پارەی گشتی دەدزێت و چ باکیشی نییە، کاتێ سەرۆکی کۆمپانیای نەسر بۆ دەزگا کارەبایی و ئەلکترۆنییەکان و سەرۆکی کۆمپانیای سەنعەتە هەندەسییەکانیش بوو، دەسەڵاتی بەکارهێنا بۆ دەسکەوتنی سامانێ دەگاتە (٢٥) ملیۆن جونەیهی میسری بە کاسبی ناڕەوا.

- پێدانی زانیاری وەهمی بە کۆمپیوتەر بۆ دزینی دارایی گشتی کە لە بانکی قاهیرە — پاریسدا روویدا، کاتێ بەڕێوەبەری ژمێریاری و بەڕێوەبەری ئیدارەی دەرەکی کۆمەڵێ فەرمانبەری چەتەیان بەڕێوە دەبرد و نزیکەی (١٠) ملیۆن جونەیهیان دزی بە هەڵوەرگرتن لە لاوازی دەزگا چاودێرییەکان.

ڕاپۆرتی دەزگە چاودێرەکانیش دووپاتی دەکەنەوە کە ناڕەوا بەکارهێنانی دەسەڵات لەناو کەرتەکانی دەوڵەتدا لە زیادبوونێکی بەردەوامدایە، ساڵی ١٩٩٧، ٦٧ هەزار سەرپێچی و ساڵی ١٩٩٨، ٦٦ هەزار تومار کرا هەروەها لە سەعاتێکدا ٢٦ فەرمانبەر لە دادگەدا ڕەوانەی نوێنەرایەتی گشتی دەکرێن، لە هەموو ڕۆژێکیشدا ١٨٠ سەرپێچی دەکرێ ئەمەش ژمارەیەکی پێوەریە لە جیهاندا، ئەم سەرپێچییانەش لە کردن نەدەهات ئەگەر دەزگە چاودێرەکان لاواز نەبایەن و سزا ڕێگرەکان لە گەندەڵی زۆر توند نەبوایەن، لە هەندێ بانکی سوریاش ئەم

سەرپێچییانە روویداوە، کۆڵینەوە دادگەییەکانیش لە میسردا دەریانخستووە کە کێشەکانی گەندەڵی دوو جۆرن:

**یەکەمیان:** کێشەی گەندەڵییە گەورەکان کە دزی تێدا دەگاتە ملیۆنان جونەیهی میسری.

**دووەمیشیان:** کیشەی گەندەڵی بچووکە کە دزییەکانی دەگاتە دەیان هزار، رووی لەیەکچوونی هەر دوو جۆریش وەدەستهێنانی پارەیە بە هەر شێوەیەبێ. ئەگەر زانیمان ئەو سەرپێچیانەی لە لایەن دەزگەی دادگەییەوە گیراوە لەوەیە رەنگدانەوەی واقیع نەبێ، لەوانەیە پارە دزراوەکان زۆر لەوە زیاتربن، لەبەر فرەی لایەنەکانی گەندەڵی و فرە جۆری شێوازەکانیان لە رفاندنی پارە بۆ دەرەوەو دەسپێبکەو تا دەگەیتە پاك کردنەوەی.

شێوازە نارەواکانی کۆکردنەوەی سامانیش دەکرێنە دوو جۆرەوە:

**یەکەمیان:** شێوازە راستەوخۆکان کە لە کێشە گەورەکاندا بەکاردەهێنرا وەکو پرۆژەنامەی گومانلێکراو لەتەك هەندێ لایەنی حکومیدا کە چاوەپۆشن لە پەیرەوکردنی مەرجە تەکنیکییەکان و ئاسانکاری لە نرخەکاندا دەکەن بەرامبەر برێك پارە، یان رفاندنی شمەك بەبێ گومرکدان، بازرگانی لە بازاڕی رەشدا بە پارە و شمەکی قەدەغەو، دەسکەوتنی پارەو دەڵاڵی و کلاۆنانە سەر بانك بۆ وەدەسهێنانی قەرزی بێ گرەنتی، سەربارەی کلاۆنانە سەر تاکەکان بە شێوازی پارە کۆکەرەوەکان کە ناوبانگی زۆریان وەرگرت لە میسردا.

**دووەمیشیان:** شێوازە ناراستەوخۆکان کە زۆرجار لە کێشەی گەندەڵییە بچووکەکاندا بەکاریدەهێنن وەکو دەسکەوتنی مولەت، پێشکەشکردنی ئاسانکاری، قۆستنەوەی تاقە یاساییەکان و بەکارهێنانی دەسەڵات، تەزویری قەواڵە، قورخکردنی شوێنەکانی بەشینەوەی شمەك، قۆپی، درۆ، ناچارکردن،



بەرتیل، سەرپێچی لە یاسا کارپێکراوەکان، زۆرجاریش شێوازە ناراستەوخۆکان پشت بە بەرتیل دەبەستن.

شێوازی تێهەڵکێشیش هەیە لە گەندەڵکاریدا کە هەر دوو شێوەی تێدایە، واتە لەوەیە چەند ئامرازێکی ناراستەوخۆ بکرێتە یارمەتی بۆ ئامرازێکی راستەوخۆ.

شێوازە باوەکانی گەندەڵی ئیداریش دزینی دارایی گشتییە بە تەزویرو شاردنەوەی هەندێ قەواڵە. زۆربەی کێشەکانی گەندەڵیش لە بواری ئابووریدا روودەدەن کە لە چوارچێوەیدا کۆمپانیا وەهمییەکان و نووسینگەی هەناردەو هاوردەو دەڵالی بازرگانی و گرێبەندی هاوردەو خانوبەرەو زەوی روودەدەن، مەیدانی دووەمیش بازاڕی رەشە لە بابەت بازرگانی قەدەغە وەکو بێهۆشکەرەکان و تەزویری پارەو رفاندنی پارە، مەیدانی سێیەمیش بانکە، زۆرجاریش گەندەڵکاران ئەم ئیشانە بەشوێن یەکدا دەکەن یان پێکەوە. شیاوی ئاماژە پێکردنە سێ توێژ هەن گەندەڵکاری گەورە دەکەن:

١- توێژی ئەو کاربەدەستانەی پەیوەندی راستەوخۆ، یان ناراستەوخۆیان هەیە بە گەورە بەرپرسانەوە، پەیوەندی خزمایەتی، هاورێتی، ژنخوازی وەکو کێشەی عیسمت سادات و کوڕەکانی، ناوبراویش برای سەرۆکی پێشوی کوژراوە، «ئەنور سادات».

٢- توێژی ئەو گەورە بەرپرسانەی شوێنی گرنگیان هەیە لە پەیکەری ئیدارەی دەوڵەتدا وەکو ئەوانەی لە بازرگانی بە پارەو لە کێشەی بانکی قاهیرە — پاریسدا تووشبوون «مەمدوح ئەللەیسی و عەبدولۆهاب ئەلحباك»[٤٣].

٣- توێژی پیاوانی کار کە بە دەستێکەڵکردن لەتەك گەورە بەرپرساندا گەندەڵکاریان کردووە وەکو «هودا عەبدولمونعم، مونا ئەلشافعی، ئەلسەعد، ئەلرەییان» هی دیکەش لەوانەی پارەی دەسهاتە کەمەکان کۆدەکەنەوە.

لەبارەی کێشەی گەندەڵییە بچووکەکانیشەوە ئەوە زۆربەیان فەرمانبەری حکومین لە ئاستە نزمەکان و بەرزەکانیشدا، گەندەڵکاریش پلە بە پلە دێت بە شوێن ئەو قۆناغە گەشەکردنە ئابووری و کۆمەڵایەتییانەی میسری عەرەبی پێیدا تێپەڕیوە، بۆ نموونە لە حەفتاکاندا گەندەڵی لە شێوەی بازرگانی ناڕەوا بە شمەکی خواردەمەنیەوە دەکرا، لە هەشتاکانیشدا بازرگانی بە پارەی بیانو رفاندنی شتی قەدەغەکراو، کەچی لە نەوەدەکاندا گەندەڵی لە تۆری بانکیدا بلاّو بووەوە، زۆربەی گەندەڵکارانیش هەندێ بەرپرس و پیاوانی کاری بۆگەنن.

## شێوەکانی گەندەڵی لە میسردا

گەندەڵی لە میسردا بەم تایبەتییانە تاك بووەوە:

١- کێشە گەورەکانی گەندەڵی مۆرکی کۆییان هەڵگرتووە لە چوارچێوەی تورێکدا، کە لە رێکخستنە نهێنییەکانی مافیا دەچێت و پەیوەندییەکانیشیان بە نهێنییە. هەندێجار هەندێ خێزان بەتەواوی گەندەڵکارییان دەکرد بۆ پاراستنی نهێنی چالاکییەکانیان و قوتار بوون لە یاسا کارپێکراوەکان وەکو کۆمپانیاکانی «رەشاد عوسمان، تۆفیق عەبدولحەی، عیسمەت ئەلسادات». گروپە گەندەڵکارەکانیش لە ململانێدان لە سەر بنەمای یەکێتی دژەکان و یەکێتی بەرژەوەندییەکان. بەهێزەکانیش بەرتیل وەردەگرن لە بێهێزەکان زۆر جاریش ئەم گروپانە پەیوەندی دەبەستن لەتەك گەورە بەرپرسانی دەوڵەتدا تا ئاسانکاریان بۆ بکەن و بیانپارێزن.



هەندێ ئەندامی ئەم گروپانەش تێکەڵی دامەزراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی و رێکخراوە ناحکومیەکان دەبن وەکو پارتەکان و سەندیکا پیشەییەکان و ئەنجومەنی بەرێوەبردنی کۆمپانیاکان یان بانکەکان.

بەڵام کێشە بچووکەکانی گەندەڵی کە مورکی ئیداری پێوەیە ئەوە تاکەکان تێپەر ناکات و دوورە لە رێکخستنی تۆڕیەوە، واتە گەندەڵکاری ئیداری بە شێوەی تاکی دەکرێت و کەمجار زیاتر لەلایەنێ بەشدار دەبێ تێیدا.

٢- دووبارە بەرهەمهێنانەوەی گەندەڵی بە یاساو میکانیزمەکانی خۆی. هەندێ وێنەی گەندەڵی هەیە خۆبەخۆیی بە وەدیهێنانی ئامانج تەواو دەبێ و هەندێ دیکەی سەر لە نوێ پەیدا دەبێتەوە و بەردەوامەبێ لە هەبوونی کەشی گەندەڵیدا. ئەو گەندەڵیەی خۆی بەرهەم دەهێنێتەوە وەکو نیمچە دامەزراوەیەکی لێدێ چالاکییەکانی لە چوارچێوەی هاوپەیمانیەکدا بەرێوەدەبا لە نێوان رەگەزەکانی گەندەڵی و هەندێ گەورە بەرپرس کە لە ژێر لەخشتەبردنی داراییدا تووشی گەندەڵی دەبن، لە دوای تووشکردنی بازنە ناوەندییەکانیش لە فەرمانبەرە بچووکەکان گەندەڵکارییەکان یەکتر تەواو دەکەن ئەوجا بازنەی گەندەڵی فراوان دەبێتەوە یان ئەوەی هەندێ کەس پێی ئێژێ «چەند جارەی گەندەڵی» لەسەر شێوەی «چەند جارەی وەبەرهێنانی» ی کینز، واتە گەندەڵی وەکو پەتایە لە ناوەندەێکەوە بۆ یەکێکی دی خێرا بلاّو دەبێتەوە لەژێر کاریگەری «بریسکەی پارە» ئەو گەندەڵیەش دووبارە خۆی بەرهەم دەهێنیتەوە وەکو روژ پەرست خۆی رەنگدەکات لە هەر قۆناغێکدا بە بەرگێ تازەوە دەرەکەوێت و لە بواری نوێدا ئیش دەکا بەبێ ئەوەی لە ئامانجە بنچینەکانی لە کۆکردنەوەی سامانی ناڕەوا لابدات، وەکو ئەوەی لە میسردا روویدا کاتێ گەندەڵی لە هاوردن بەبێ گۆڕینەوەی پارچە ئامێری بیانی چوو بۆ بازرگانی بەشمەکی خواردەمەنی لەوێشەوە بۆ رفاندنی پارەو کۆکردنەوەی پارە لە دەسهاتە دیاریکراوەکان و کلاّونانە سەر بانکەکان. چونکە گەندەڵی توانای خۆگونجاندنی خێرای هەیە لەتەك هەلومەرجی کات و شوێندا، بەبێ وازهێنان لە

ئیشە سەرەکییەکەی لە لەکارخستنی یان راستکردنەوەی یان گۆڕینی یان دەسکاری ئەو یاسایانەی خزمەتی بەرژەوەندییەکانی ناکەن، هەروەها بلاّوکردنەوەی بەهای غەوارە لە سەر کۆمەڵگە وەکو گشتاندنی کولتووری کۆمەڵگەی بەکاربەرو بلاّوکردنەوەی خراپەو شەڕکردنی رێسای بەها کۆییەکان وەکو شەرەف و پاکی و راستڕەوی لە ئیشکرندا، گوایە ئەم بەها پەسەندانە جێهێشتەی رابوردون و ئیشە مێژوییەکەی خۆیان تەواو کردوەو بەکەڵکی ئەم زەمانە نایەن.

گەندەڵی وەزیفی نییە و لە کاتێکدا هەندێ کەس وای بۆچوون کە گەندەڵی وەزیفی دەتوانێ پەلە بکات لە پرۆسەی گەشەی ئابووری لە قۆناغێکدا، کەچی ئەو سامانانەی لەلای هەندێ تاکی میسریدا کۆکرانەوە زۆربەی بەری چالاکی بەرهەم هێنەر نین هەندێ بەری کاسبی نارەوان (دزی، رفاندن، کلاّو لەسەرنان، فێڵبازی، قورخکردن...هتد) زۆربەی ئەو سامانەش رفێنراون بۆ دەرەوە و دەرامەتەکانی وڵاتی داچۆران لە کاتێکدا وڵات گەلێ پێویستی پێیانە.

٣- گەندەڵی رەنگدانەوەی کۆمەڵایەتی ترساناکیشی هەیە، چونکە لەتەك رۆژگاردا دیاردەی جەمسەرگرتنی کۆمەڵایەتی قووڵدەکاتەوە، بە دووبارە بەشینەوەی دەسهات و لە بەرژەوەندی توێژە مشەخۆرەکانی کۆمەڵگەو لەسەر حسابی دەسهاتە دیاریکراوەکان، ئەمەش شلەژانی کۆمەڵایەتی و نائارامی دەخولقێنێ. لەوە پتریش هەندێ هۆکاری وەرگیراو لە خزمایەتی و ناسیاری و لەخشتەبردنەوە پرۆسەی بزاوتی کۆمەڵایەتی دەجولێنن، لە باتی ئەوەی لە رێسای بەها کۆییەکانەوە وەربگێرێ وەکو لێزانی و کارامەیی تەکنیکی و ئیداری.

هەروەها گەندەڵی دەبێتە هۆی لادانی دامەزراوەکان لە ئامانجە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانیان، چونکە لە هەر بارێکدا نابێ پاکانەی بەرتیل بکەین وەکو ئامرازێ بۆ باشکردنی موچەی فەرمانبەرە بچووکەکان یان گەورەکان، چونکە



بەرتیل سەرباری ئەوەی لە رووی ئەخلاقیەوە ناپەسەندە، ئەوە دەبێتە هوێ دووبارە بەشینەوەی دەسهات بەشێوەیەکی نادادوەرو جیاوازی چینایەتیش قووڵدەکاتەوە.

بەوەڕوخستنی هەندێ لە تایبەتییەکانی گەندەڵی لە میسردا دەتوانین ئەم ئەنجامانە دەربێنین:

**یەکەم:** سەرەڕای نەبوونی زانیاری ورد سەبارەت بە قەبارەی راستەقینەی گەندەڵی لە میسردا ئەوە نیشانەکانی ترسناکی گەورە پیشان دەدەن، ئەگەرچی گەندەڵی سنووری ئەو کێشانەی خرانە بەردەم دادگەی تێنەپەراندبێ. گەر زانیمان قەبارەی نموونەیی گەندەڵی «سفرە» و دۆزینەوە و شەڕکردنی گەندەڵی دیاردەیەکی باشەو رەنگدانەوەی پەیوەندی گشتە بە تایبەتەوە، رێزگرتن و جێبەجێکردنی یاساکانیش بنەمایە و گەندەڵیش لێدەرکردنەو پێویستە شەڕی بکرێت، چونکە هەڕەشەیە لە سەر رژێمی رامیاری و پاچینەی کۆمەڵانیش تێکەدات، بە دەسپێکردن لە قەبارەی نموونەیی گەندەڵیەوە کە تێچوی بەگژاچوونی لە زیانی پترە، ئەوە دەبینین گەندەڵی لە میسردا سنووری تێپەڕاندووە، چونکە تێچوی بەرنگاربوونەوەی زۆر کەمترە لە زیانەکانی، ئەمە لەو گریمانەوە کە قەبارەی راستەقینەی گەندەڵی هەر ئەوەندەیە کە دەخرێتە بەردەم دادگە.

**دووەم:** پرۆسەی خۆدزینەوەی گەندەڵکاران ماوەیەکی زۆری خایاند و هەندێ جار دەگەیشتە ٢٠ ساڵ دوای ئەوەی سامانیان بەشێوەیەکی سەرنج راکێش پەرەی سەند، ئەمەش لە رووی کردارەکیوە نەکاری دەزگە بەرپرسەکان دەگەیەنێ کە زۆر جار هۆی نەتواناییەکەیان دەگەڕێننەوە بۆ ئەو یاسایانەی دەسەڵاتەکانیان کەلەبچە دەکەن، وەکو رێزگرتنی مافی مرۆڤ و هەندێ ئەخلاقی کۆمەڵایەتی کە نایەڵێ خەڵك لە سەر گومان تاوانبار بکرێت «تۆمەتبار بێتاوانە هەتا تۆمەتەکەی دەسەڵمێنرێ»، «بیتاوانکردنی هەزار تاوانبار باشترە لە تاوانبارکردنی یەك

بێتاوان...» هتد بە پێداچوونەوەی هەندێ بڕیاری تاوانبارکردنی گەندەڵکاران ئەمانە تێبینی دەکرێ:

- هەندێ کەس ساڵانێ درێژ گەندەڵکارییان کردووە هەتا گیراون وەکو کێشەی عیسمەت سادات [٤٤].
- هەندێ گەندەڵکار لە دەستی داد هەڵاتوون یان رفێنراون بۆ دەرەوە وەکو کێشەی هودا عەبدولمونعم [٤٥].
- پێشکەشکردنی پەڕەی تەزویرکراو بە دادگە هەندێ گەندەڵکاری بێتاوان کردووە وەکو کێشەی حباك.
- درێژکردنەوەی ماوەی دادگەیی کردن تا ئەو رادەی هەندێکی پتر لە دە ساڵی خایاند.
- نا هاوڕێژەیی تاوان و سزا، خەریکە سزای ئەوەی ملیۆنان جونەیهی بە تالآن بردبێ نزیك بێ لەوەی چەند هەزارێکی دزیوە.

**سێیەم:** ئامادەکردنی ژینگەیەك گەندەڵی لە باوەش بگرێت، سالەبەر ئەوەی دەزگە بەرپرسەکانی بەگژاچوونی گەندەڵی کەمتەرخەمبوون یان تاڕادەیەك ئاسانکاری و لێبوردوییان پیشانداوە لەتەك گەندەڵکاراندا، ئەوەش قاپی کردەوە بۆ گۆڕینەوەی سوودی تایبەتی لە ژێر پەردەی رەوایەتی کە دوورایی دامەزراوەیی لە دەسداوە و هەروەها دوورایی یاساییش کە کەمێتی و تاقی زۆری بە سەردا هاتووە و تاڕادەیە گەندەلکاری ئاسانکردووە، سەرباری دوورایی ئیداری کە هاوتایی سنووری هەر سێ دەسەڵاتەکەی لەدەسداوە، ئەمە جگە لە دوورایی کۆمەڵایەتی کە گۆڕانی بەپەلە لە ژینگەی کۆمەڵگەیی میسری و لە رێسای بەها کۆییەکانیدا روویداوە، بەکاریگەری ئەم هۆکارە دامەزراوەیی و یاسایی و ئیداری و کۆمەڵایەتیانە کەشی گونجاو ئامادە بوو بۆ هاوپەیمانی ناپیرۆزی نێوان دەسەڵات و پارە کە گەندەڵی زیاتری وەبەرهێناوە و باجەکەشی لەسەر جەماوەری بێدەسەڵاتە.



## بەگژاچوونی گەندەڵی لە میسردا

دەوڵەت هەستی بەو مەترسیانە کرد کە لە گەندەڵکاریەوە هەڕەشەی لێدەکات بۆیە حکومەت پاینا لەم هەڵسوڕانانە[٤٦]:

١- چارەکردنی شوێنەوارە لاوەکییەکانی جێبەجێکردنی سیاسەتی چاکسازی ئابووری و بەرنامەکانی جێگیرکردن و گونجاندنی پەیکەری بەپشت بەستن بە دەسپێکی بینراوەیی وەکو ئامرازێك بۆ ئاشکراکاریی و راگەیەنراوی بۆ دەرخستنی شوێنی ئەو شپرزەییانەی ولات بە دەستیەوە دەناڵێنێ.
٢- پتەوکردنی کەشی دیمۆکراتی بە بەرەلاکردنی دەستی گشت هۆکانی راگەیاندن بو دۆزینەوە و نیشانکردنی حاڵەتە بۆگەنەکان و دانانیان لە ژێر وردبینی لایەنە بەرپرسەکان.
٣- پەرەپێدان و راستکردنەوەو لەکارخستن و دەرکردنی یاساگەلێك کە بەدەنگ گۆڕانکاریە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی دەوڵەتەوە بچێ بۆ پڕکردنەوەی ئەو تاقانەی گەندەڵکاران دزەی لێوە دەکەن.
٤- باشکردنی وەجێگەیاندنی حکومی لە بەرێوەبردنی پرۆژەکانی دەوڵەت و زاڵبوون بەسەر دەرامەتە گشتییەکان کە لەوەرگەیەکی بەپیتە بو گەندەڵکاری رامیاری و ئیداری.
٥- هاوکاری لەتەك دەوڵەتەکانی دیکەدا بەمۆرکردنی رێکەوتن بۆ گۆڕینەوەی زانیاری سەبارەت بە گەندەڵی و بەگژاچوونەوەی بەئامانجی تەنگ هەڵچنین بەو تاك و کۆمپانیانەی گەندەڵکاری دەکەن.
٦- توندکردنی چاودێری لە سەر چالاکی کەرتی تایبەت و چاودێری ئەو چالاکیە رێپێنەدراوانەی هەندێ پیاوانی کار خەریکین.

٧- بەکارخستنی رۆڵی دەزگەی چاودێری و دەزگە ناوەندی لێپرسینەوەش بخرێتە سەر دیوانی سەرۆکایەتی کۆماری بۆ پتەوکردنی رۆڵی لە لێکۆڵینەوە لە سەلامەتی خەرجی حکومیدا.

بۆ بەرنگاربوونەوەی هەموو شێوەکانی گەندەڵێش سەرۆك حوسنی مبارەك لە ساڵی ١٩٨١ بڕیاری کۆماری دەرکرد بۆ دووبارە ئیشکردن بە دەزگەی چاودێری ئیداری، کە خەریکی پشکنین دەبێ لەو سەرپێچی و تاوانکاریانەی لە سەروەری یاسا کەمدەکەنەوە.

ئەم هەڵسوڕانانە و هی دیکەش دیاردەی گەندەڵی سووك کردەوە لە میسردا وەلێ کۆتایی پێنەهێنا، سەرەڕای هەبوونی ویستی رامیاری هێشتا هەندێ وێنەی گەندەڵی هەر هەیە.

کەوایە نە زێدەڕۆیی و نە لێبوردەیی لە جێبەجێکردنی یاسادا دەتوانێ گەندەڵی ریشەکێش بکا بە پاککرنەوەی ژینگەی خوجێی لەو هۆکارانەی هانی گەندەڵکاری دەدەن کە تایبەتێتی خوجێیی وەردەگرن وەکو:

- بانکی ناوەندی میسری ئەو دەسەڵاتەی هەبێ کە زاڵی بکا بەسەر سیاسەتی بانکی و پارەییدا دوور لە دەسەڵاتی وەزارەتی ئابووری کە جولەی بانك کەلەبچە دەکات و نایەڵی دەسبگرێ بەسەر هەردوو سیاسەتی دارایی و پارەییدا.
- دامەزراندنی بەرێوەبەرەکان لەسەر بنچینەی لێزانی و شارەزای و راسترەوی و دوورخستنەوەی ئەوانەی گومانی دارایی و ئەخلاقیان لەسەرە لە ئیدارە بنچینەییەکانی دەوڵەت.



- لەکارخستنی ئەو جیاوکانەی دراوە بە خاوەن دراوی بیانی بۆ کڕینی شمەکی دەگمەن کە نرخی جونەیهی میسری پێ دادەبەزێنێت و پتر نامۆی دەکات.
- کۆتایی هێنان بە ناکۆکی نێوان یاسا کارپێکراوەکان کە لە نێوان قەدەغەیی و بەرەڵاییدایە.

ئەمەش رەنگدانەوەی خراپی دەبێ لە سەر چالاکی ئابووری و هەڵی خولانەوە و کونکردنی یاساکان بۆ گەندەڵکاران دەرخستبێ، وەکو ئەوەی لە ناوزڕانی «نۆینەرانی قەرزەکاندا» روویدا کە بە بەناوبانگترین کێشەی گەندەڵی دادەنرێ لە میسردا، ناوزڕانەکەش ئاوایە: بانکەکانی «الدقهلية»، «نيل»، «مهندسين»، «فيصل الاسلامي»، «قناة السويس» قەرزیان پێشکەش پیاوانی کاری گەندەڵکار کرد کە دەگەیشتە یەك ملیار جونەیهی میسری بەبێ گرەنتی، لە دوای لێکۆڵینەوەش لەتەك تومەتباراندا دادگەی بەرزی ئاسایشی دەوڵەت و نوێنەرایەتی گشتی ٢٥ کەسیان تاوانبار کرد بە تۆمەتی زیانگەیاندنی ئەنقەست و قازانج کردن و ئاسانکاری بۆدەسگرتن بە سەر دارایی گشتیدا، لەناو گەندەڵبووانیش چوار پەرلەمانتار یەکێکیان پێشتر وەزیر بووە و هەمووشیان سەر بە حزبی نیشتمانی فەرمانڕەوان[٤٧].

لیبیاش کێشەی گەندەڵی بانکی تێدایە، دادگە لیبییەکان تۆمەتی پێدانی قەرزی گومانلێکراویان ئاراستەی ١٧ فەرمانبەری بانکی کرد بە کەسێلێك مەرجە پێویستەکانیان تێدا نەبوو، لە تووشبوانی ئەم کێشەیەش حاکمی بانکی ناوەندی و وەزیرێك[٤٨].

پێش ماوەیەك سوریاش تووشی کێشەی گەندەڵی بانکی بوو بە تایبەت لە لقەکانی بانکی کشتوکاڵی و هەرەوەزیدا، ژمارەیە تومەتباریش ئاراستەی دادگە کران، هەروەها ناوزڕانی بانکی مەغریبیشی گرتەوە، لەوێدا چوار بانك «قەرزی

کشتوکاڵ»، «قەرزی خانوبەرەیی و گەشتیاری»، «بانکی میللی»، «سندوقی دابینکاری کۆمەلاٌیەتی» بوونە هۆی بەفیڕۆچونی ١,٥ ملیار دۆلار، واش دیارە بانکە عەرەبییەکان گەندەڵی بەر لە بەرژەوەندی نەتەوەیی یەکیانی خستووە.

سەیرترین شتیش ئەوەیە کە گەندەڵبووە عەرەبەکان شێوازی وا دادەهێنن زانراو نییە لەو دەڵەتانەی کۆنن لە گەندەڵکاریدا وەکو فرۆشتنی وەزیفەی وەهمی لە مەغریب بەرانبەر بەرتیلێکی لەخشتەبەر بۆ هەندێ بەرپرس (٤٩).

بەگوێرەی ئەمەی رابورد زەحمەتە گەندەڵی بە هەموو ئاستەکانی لە سنوور بدرێت بەبێ هەبوونی ویستی رامیاری پشت بەستبوو بەویستی جەماوەری و رای گشتی رۆشنبیرەکە بە هەستی بەپرسیەوە بینراوە کاری بکات و بەبێ پابەندبوونی خاوەنی بڕیارە ئابووری و رامیارییەکان پێش خەڵکی دیکە بەرێزگرتن و سەروەری یاسا، ئەم پرسیارە و وەڵامەکەشی بەکراوەیی دەمێنێتەوە. چی دەبێ ئەگەر شەڕی خەڵکانێ بکەین شمشێریان بەدەستەو لە چڵکاودان، ئایە نوقمیان دەکەین بەبێ ئەوەی کەس خەفەتیان بۆ بخوات، یان لە تەکیاندا نوقمبین؟



## سەرچاوەکان


١- تحرير د. مصطفى كامل السيد و د. سلام سالم زرنوقة- الفساد و التنمية – مركز دراسات و بحوث الدول النامية كلية الاقتصاد و العلوم السياسية بجامعة القاهرة عام ١٩٩٩.

٢- حسنين توفيق- بناء المجتمع المدني – المؤشرات الكمية و الكيفية – مجموعة من الباحثين في المجتمع المدنى في الوطن العربي و دورة في تحقيق الديمقراطية- مركز دراسات الوحدة العربية للبحوث ١٩٩٢.

٣- تقرير عن التنمية في العالم ١٩٩٧-الدولة في عالم متغير، البنك الدولي للانشاء و التعمير الترجمة العربية، القاهرة- مركز الاهرام للترجمة و النشر د..ت.

٤- د. احمد رشيد –الفساد الاداري –الوجه القبيح للبيروقراطية المصرية – القاهرة – مطبوعات الشعب – طبعة اولى- شباط ١٩٧٦.

٥- د. محمد عبد الفتاح ياغي – الاخلاقيات في الادارة العامة –عمان – مركز احمد ياسين للنشر و التوزيع ١٩٩٥ .

٦- د. فاروق يونس، مبادى علم السياسة –القاهرة- مكتبة عين الشمس –عام ١٩٨٦.

٧- د. اكرم بدر الدين - ظاهرة الفساد السياسي – النظرية و التطبيق – دار الثقافة – القاهرة -١٩٩٢.

٨- د. ثروت بدوي –النظم السياسة –القاهرة – مكتبة النهضة المصرية ١٩٨٥.

٩- منير حميد البياتي –الدولة و النظام السياسي الاسلامي – دراسة دستورية مقارنة رسالة دكتوراة في الحقوق – جامعة القاهرة – كلية الحقوق د.ت.

١٠- الاعلان العالمي لحقوق الانسان –انضر نصة في الامم المتحدة –الوثيقة الدولية لحقوق الانسان القاهرة –مطابع دار الشعب ١٩٨١.

١١- وحيد عبد المجيد – الديمقراطية و الاحزاب السياسية في فكر الديمراطية الاشتراكية – مركز الدراسات الاستراتيجية و السياسية في الاهرام ١٩٨٠.

١٢- د. نعمان الخطيب –الاحزاب السياسية و دورها في انظمة الحوكم المعاصر – دار الثقافة للنشر و التوزيع – القاهرة ١٩٨٣.

١٣- عيد الجهني –الرقابة الادارية بين القانون الاداري و علم الادارة العامة – رسالة دكتوراه- جامعة عين الشمس –كلية الحقوق د.ت.

١٤- دلال البزري – مفهوم الجزوة و الحاكمية – موْتمر اسلوب ادارة شوْون الدولة و المجتمع – مركز دراسات واستشارات الادارة العامة – كلية الاقتصاد و العلوم السياسية –القاهرة ١٩٩٩.

١٥- الفساد في الحكومة –تقرير الندوة الاقليمية – مركز التنمية الاجتماعية و الشوْون الانسانية بالامم المتحدة لاهايي، هولندة –كانون اول ١٩٨٥- عمان –المنظمة العربية للتنمية الادارية – تراجم مختارة رقم ٣٢٩- ١٩٩٣.

١٦- هشام يس محمد عبد الهادي التوانسي –خلفيات الخدمة المدنية – دراسة مقارنة مع التطبيق على الحالة المصرية – رسالة ماجستير – كلية الاقتصاد و العلوم السياسية بجامعة القاهرة -١٩٩٨.

١٧- الفساد في الحكومة – مركز التنمية الاجتماعية و الشوْون الانسانية في الامم المتحدة – عمان – المنظمة العربية للتنمية الادارية – تراجم مختارة رقم ٣٢٩- ١٩٩٣.

١٨- د. احمد رشيد – الفساد الاداري – الوجة القبيح للبيرقراطية المصرية. مطبوعات الشعب – طبعة اولى – القاهرة ١٩٧٦.

١٩- حمد عبد الرحمن – الفساد السياسي في افريقيا – القاهرة – دار القارئْ العربي ١٩٩٦.

٢٠- تقرير التنمية في العالم – من الخطة الى السوق – مركز الاهرام للترجمة القاهرة ١٩٩٦.

٢١- عبد الطيف عبد الحميد محبوبة – من احلال الواردات الى التضيع للتصدير – عوامل النجاح الكوري – كراسات استراتيجية العدد ١٥ ايار ١٩٩٣.

٢٢- حسنين هيكل – خريف الغضب – (فضا ئح الفساد في المصر ).

**الصحف**

- صحيفة الحياة – العدد ١٣٦٢٠ تاريخ ٢٦ / ٦ /٢٠٠٠.
- صحيفة الحياة –العدد١٣٦٢٢ تاريخ ٢٨/ ٦/ ٢٠٠٠.
- سراج الدين محمد – سوهارتو و الخطايا العشر – الملف السياسي ملحق صحيفة البيان الاماراتية – العدد ٣٦- تاريخ ٢٩/ ٥/ ١٩٩٨.
- صحيفة الحياة – العدد ١٣٦١٩- تاريخ ٢٥ / ٦/ ٢٠٠٠.
- صحيفة الحياة – العدد ١٣٦٢٠- تاريخ ٢٦/ ٦/ ٢٠٠٠.
- صحيفة الحياة – الاعداد ١٣٦١٨-١٣٦٢٠ ، حزيران عام ٢٠٠٠.



## پەراوێزەکان

١- تحرير د. مصطفى كامل السيد و د. سلام سالم زرنوقة – الفساد والتنمية. مركز دراسات و بحوث الدول النامية – كلية الاقتصاد والعلوم السياسية بجامعة القاهرة عام ١٩٩٩.

٢- المصدر السابق نفسه.

٣- حسنين توفيق – بناء المجتمع المدني – المؤشرات الكمية والكيفية – مجموعة من الباحثين في المجتمع المدني في الوطن العربي ودورة في تحقيق الديمقراطية – مركز دراسات الوحدة العربية للبحوث ١٩٩٢.

٤- تقرير عن التنمية في العالم ١٩٩٧- الدولة في عالم متغير. البنك الدولي للانشاء و التعمير الترجمة العربية. القاهرة. مركز الاهرام للترجمة و النشر د. ت.

٥- د. احمد رشيد – الفساد الاداري –الوجة القبيح للبيروقراطية المصرية – القاهرة. مطبوعات الشعب.طبعة اولى – شباط ١٩٧٦.

٦-د.محمد عبد الفتاح ياغي – الاخلاقيات في الادارة العامة. عمان –مركز احمد ياسين للنشر و التوزيع ١٩٩٥،ص ١٠٨- ١١٠.

٧- سراج الدين محمد – سوهارتو و الخطايا العشر – الملف السياسي ملحق صحيفة البيان الاماراتية – العدد ٣٦- تاريخ ٢٩/ ٥/ ١٩٩٨.

٨- للتفاصيل راجع صحيفة الحياة – العدد – ١٣٦٢ – تاريخ ٢٦/ ٦/ ٢٠٠.

٩- صحيفة الحياة – العدد ٢٦٢٢ تاريخ ٢٨/ ٢٠٠٠/٦.

١٠- سراج الدين محمد – سوهارتو و الخطايا العشر – الملف السياسي ملحق صحيفة البيان الاماراتية – العدد ٣٦- تاريخ ٢٩/ ٥/ ١٩٩٨.

١١-د. اكرم بدر الدين – ظاهرة الفساد السياسي – النظرية والتطبيق، دار الثقافة – القاهرة – ١٩٩٢، ص ٢٦ ٤١٠.

١٢- صحيفة الحياة – الاعداد ١٣٦١٨-١٣٦٢٠ – حزيران عام ٢٠٠٠ .

١٣-د. اكرم بدر الدين – مصدر سابق، ص ٤٠.

١٤- د. ثروت بدوي – النظم السياسية. القاهرة. مكتبة النهضة المصرية ١٩٨٥- ص ٢٢٨-
٢٤٠ منير حميد البياتي – الدولة القانونية والنظام السياسي الاسلامي.دراسة دستورية مقارنة رسالة دكتوراه في الحقوق – جامعة القاهرة – كلية الحقوق د.ت.، ص ٢١- ٣١.

١٥- الاعلان العالمي لحقوق الانسان –انضر نصة في الامم المتحدة –الوثيقة الدولية لحقوق الانسان القاهرة –مطابع دار الشعب ١٩٨١، ص ٩-١٦ .

١٦- وحيد عبد المجيد – الديمقراطية و الاحزاب السياسية في فكر الديمراطية الاشتراكية – مركز الدراسات الاستراتيجية و السياسية في الاهرام –القاهرة – ١٩٨٠، ص ١٢٠٠ .

١٧- د. نعمان الخطيب –الاحزاب السياسية و دورها في انظمة الحوكم المعاصر – دار الثقافة للنشر و التوزيع – القاهرة ١٩٨٣، ص ٩٠- ٩٧.

١٨- عيد الجهني –الرقابة الادارية بين القانون الاداري و علم الادارة العامة – رسالة دكتوراه- جامعة عين الشمس –كلية الحقوق د.ت. ص ٨٠٠.

١٩- دلال البزري – مفهوم الجزوة و الحاكمية – موْتمر اسلوب ادارة شوْون الدولة و المجتمع – مركز دراسات واستشارات الادارة العامة – كلية الاقتصاد و العلوم السياسية –القاهرة ١٩٩٩، ص ٥٠.

٢٠- نفس المصدر السابق – ص ٦٠.

٢١- د. مصطفى كامل السيد و د. سلام سالم زرنوقة- الفساد و التنمية – مركز دراسات و بحوث الدول النامية كلية الاقتصاد و العلوم السياسية بجامعة القاهرة عام ١٩٩٩، ص ٩٤٠.

٢٢- الفساد في الحكومة –تقرير الندوة الاقليمية – مركز التنمية الاجتماعية و الشوْون الانسانية بالامم المتحدة لاهايي، هولندة –كانون اول ١٩٨٥- عمان –المنظمة العربية للتنمية الادارية – تراجم مختارة رقم ٣٢٩- ١٩٩٣، ص ٤٧-٤٨.

٢٣-المصدر نفسه، ص ٤٩.



٢٤- هشام يس محمد عبد الهادي التوانسي –خلفيات الخدمة المدنية – دراسة مقارنة مع التطبيق على الحالة المصرية – رسالة ماجستير – كلية الاقتصاد و العلوم السياسية بجامعة القاهرة - ١٩٩٨، ص ١٧.

٢٥-تحرير د. مصطفى كامل السيد و د. سلام سالم زرنوقة- الفساد و التنمية – مركز دراسات و بحوث الدول النامية كلية الاقتصاد و العلوم السياسية بجامعة القاهرة عام ١٩٩٩. ص ٤٧-٤٨ .

٢٦- الفساد في الحكومة – مركز التنمية الاجتماعية و الشْوون الانسانية في الامم المتحدة – عمان – المنظمة العربية للتنمية الادارية – تراجم مختارة رقم ٣٢٩- ١٩٩٣، ص ٥٢-٥٣.

٢٧- المصدر نفسه- ص ٥٣.

٢٨- الفساد والتنمية – مصدر السابق- ص ٥٤- ٥٥.

٢٩- د. احمد رشيد – الفساد الاداري – الوجة القبيح للبيرقراطية المصرية. مطبوعات الشعب – طبعة اولى – القاهرة ١٩٧٦.

٣٠- الفساد في الحكومة – مصدر سابق، ص ٦٦- ٦٧.

٣١- الفساد والتنمية – مصدر سابق، ص ٦٥.

٣٢-حمد عبد الرحمن – الفساد السياسي في افريقيا – القاهرة – دار القارئْ العربي ١٩٩٣. ص ٢٧-٣٧.

٣٣- تحرير د. مصطفى كامل السيد و د. سلام سالم زرنوقة- الفساد و التنمية – مركز دراسات و بحوث الدول النامية كلية الاقتصاد و العلوم السياسية بجامعة القاهرة عام ١٩٩٩، ص ١١٨-١٢٠.

٣٤- المصدر نفسه، ص ١٢١.

٣٥- تقرير التنمية في العالم – من الخطة الى السوق – مركز الاهرام للترجمة القاهرة ١٩٩٦، ص ٢٦- ١٢٧.

٣٦- تحرير  د. مصطفى كامل السيد و د. سلام سالم زرنوقة- الفساد و التنمية – مركز دراسات و بحوث الدول  النامية كلية الاقتصاد و العلوم السياسية بجامعة القاهرة عام ١٩٩٩. ص ١٤٥- ١٥٦.

٣٧- المصدر نفسه، ص ١٥٦- ١٦٠.

٣٨- المصدر نفسه، ص- ١٧.

٣٩- د. مصطفى كامل السيد و د. سلام سالم زرنوقة- الفساد و التنمية – مركز دراسات و بحوث الدول  النامية كلية الاقتصاد و العلوم السياسية بجامعة القاهرة عام ١٩٩٩، ص ١٨٧- ١٩٠.

٤٠- المصدر نفسه، ص ١٩١.

٤١- عبد الطيف عبد الحميد محبوبة – من احلال الواردات الى التصنيع للتصدير – عوامل النجاح الكوري – كراسات استراتيجية العدد ١٥ ايار ١٩٩٣. ص ٢٠-٢١.

٤٢- الفساد والتنمية – مصدر سابق – ص ٢٠٥.

٤٣- حسنين هيكل – خريف الغضب – (فضا ئح  الفساد في المصر )

٤٤-- تحرير  د. مصطفى كامل السيد و د. سلام سالم زرنوقة- الفساد و التنمية – مركز دراسات و بحوث الدول  النامية كلية الاقتصاد و العلوم السياسية بجامعة القاهرة عام ١٩٩٩. ص ٢٦٩.

٤٥- المصدر نفسه، ص ٢٧٦.

٤٦- المصدر نفسه، ص ٢٨٣.

٤٧-صحيفة الحياة ، العدد ١٣٦٢٠- تاريخ ٢٦/ ٦/ ٢٠٠٠.

٤٨- صحيفة الحياة ، العدد١٣٦٢٢ تاريخ ٢٨/ ٦/ ٢٠٠٠.

٤٩- المصدر نفسه العدد ١٣٦٢٢ تاريخ ٢٨/٦/ ٢٠٠٠.



## فەرهەنگۆك

| عەرەبی | كوردی |
|---|---|
| اخلاق | ئەخلاق |
| اكتفاءذاتي | بەشبەحاڵی |
| اعاقة / عرقلة | پاشقول |
| اقدام | پاهەڵنان |
| استثناء | لێدەركردن |
| افلاس | سەرساجعەلی |
| انقلاب | هەڵگێڕانەوە |
| بعد | دوورایی |
| تهريب | رفاندن |
| تكافؤ الفرص | هاوهەلی |
| ثغرة | تاق |
| سلوك | رەوشت |
| سلم | پاچینە |
| شفافية | بینراوەیی |
| صفقة | پرۆژەنامە |
| ضوابط | رێكگر، راگر |
| عدم فعالية | نەكاری |
| فعالية | بەكاری |
| قضية | كێشە |
| مشكلة | ئاریشە |
| مساءلة | لێپرسینەوە |
| منظومة | رێسا |